# مونا جات

## ئەحمەدی خانی

ئەی واستەیێ وجوود کەونەین
شا یستەیێ قوربێ قاب قەوسەین
شا هەنشەهێ تەختگەهـ مەدینە
موعجز ژتە ئەوقەدەر مەدینە
سەیرا فەلەکا ن ل نک تەگا ڤەک
فەخرا مەلەکا ن ژتە سلاڤەک
شەققەلقەمەرا تەیەک ئشارەت
زا غەلبەسەرا تەیەک عبارەت
ئەی پادشەهێ سەریرلەولاک
رابەهەرە ئاسمانی چالاک
حازر ژتە رابوراق ورد فرەف،
شاترب تەرا فریشتەرەف، رەف
دارەفع ببن ژبەرتە پەردە
بێ پەردە دگەل خودێ خەبەردە
بێژێ توقەدیرو زولجەلالی
بێژێ توقەدیم ولایەزالی
ئەمُ فانی وژارومۆشت خاکین
هادی تونەبی خوئەم هیلاکین
ئەڤەل تەژبۆ چ دا مەتەعزیم
دانی ل سەرێ مەتاج تەکریم

تەشریف خەلافەتێ تەدا مە
گاڤا تەئەمانەتێ خوەدا مە
مەعلوومی تەبوو کوئەمنەزانین
قەدرێ وی ئەمانەتی نزانین
هەرچی تەژبۆمە کر ئیرادە
یەک زەڕڕە مەلێ نەکر زیادە
حاشا ژکەمال هوممەتا تە
دوورە ژجەلال ورەحمەتا تە
کوفرو گونەهان بکی بەهانە
لایق تەبتن ئەوە شەهانە
یەک روونە لنک تەکوفرو ئیمان
یەک سوونە لنک تە خولدونیران
قەهرا خوە بکی ئەگەر تو زاهر
جننەت ل مەدێ ببیتە ئاگر
وەرفەیز بکەت سەحابێ رەحمەت
دووزەخ لمەدێ ببیتە جننەت
گەرکافرو گەر گوناهکارین
بیلجوملەژ تەئومیدوارین
کەس نینەژکافروعێسیاتان
مەزهەر نەبتن ژبۆسیفاتان
کافر بووین ئەم بئیسمێ قەهار
غەففارە کوئەمکرن گونەهکار
کوفرێ تو مەگەر نەشێ ببەخشی
گەر دێ گونەهان ل مە نەبەخشی
دێ شادبن لمە شەیاتین
مەسروور ببن گەلەک مەلاعین
قەت غیرەتەئەی پەناهێ عالەم
قەت لایقە ئەی شەبانێ ئادەم
ئەو گورگێ لەعین وبەدسەرەنجام
ژێکرا بکەتن مەشوبهی ئەغنام
ئەلقسە بکی کودێوێ سەرکەش
تەنها وتەنێ بچیتەئاتەش
فیلجوملە مەجوملە خاس وعامان
عاسی وشەقی ونا تەمامان
تێکرا بشەفاعەتا خوەخاسکە
ڤێکرا مەژئاگری خەلاسکە

# نێوەرۆک





شوان
کاری وێنەگەری کورد: محەممەد ناهید

بەناوی خوا

## سەروتار

سڵاو لە خوێنەرانی بەرێز

ئیمڕۆ کەپێکەوە دەدوێین دنیا لە قەرەباڵغێکی گەورە دایە. بگرەوبەردەیەکە کە لایەنەکانی هەموو جیهانی داگرتووە. هەڵلایەکە ئەوانەی سازیان کردووە بۆیان سەروبەر ناکرێ. باسکردن لەم بشێوی یە نە کاری ئێمەیە و نەلەم باسەدا دەگونجێ بەڵام لە هەرێمی باسەکەماندا واباشە لەسەر نەخش و دەوری سەیری زانست لە دنیای پڕ هەنگامەدا بدوێین. یاخۆ واباشە لەسەر دەوری پڕ سەمەرەی زانست لەئاڵۆزی دونیادا کورتە باسێک پێشکەش بکەین.

بەر لەوە بچینە نێو باسەکەوە پێویستە ئەوە وەبیر بێنینەوە کە مەبەستمان لەزانست تەنیا باری زانستی ئەزموونی و فیزیکی یە. وەختێک دەڵێین سەیرە لەبەر ئەوەیە کە باری ژیانی مرۆڤ لە

دونیای ئیمرۆدا دووبەرەکی و بگرە جیاوازی زۆرتێدایە ئەڵبەت زانستی مرۆڤ لە باوبۆرانی خەباتی ئەودا بەربەرەکانی لەگەڵ دیاردە - کانی سروشتی وزاڵ بوون بەسەر دونیای هەستی دا دەبڕێتەوە و بەرە بەرە پێدەگا.

مرۆڤ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پێویستی بە چەند ئەسڵ هەیە .

یەکەم قانوون وزاکوونی حاکم بەسەر خوو رەوشتی سروشت دابناسێ بۆ ئەوە کە لە ئازار و تووڕەیی ئەو خۆ بپارێزێ .

دووهەم: بە لەبەر چاوگرتنی قانوونی ناسراو وەدیارخستن و خستنەرووی ، قانوونی نەناسراو بتوانێ سروشت بەردەست بکاو بە

**کەوابووزانستی بەشەر لە چوارچێوەی ناسینی قانوونی جیهان و شێوەی لەکار کردنی ئەم قانوونانەدا دەبڕێتەوە. پەس پێشکەوتنی مرۆڤ بۆگەشەی ئاگاداری ئەو لە جیهان دەبێ کەمبوونەوەی مەترسی و کەندو کولۆ وبەرفرەیی هێمنایەتی و حەسانەوە و خاترجەمی لەگەڵ بێ .**

تاشای دڵی کەلکی لێ وەربگرێ.

کەوابوو زانستی بەشەر لە چوارچێوەی ناسینی قانوونی جیهان و شێوەی لەکارکردنی ئەمقانوونانەدا دەبڕێتەوە. پەس پێشکەوتنی مرۆڤ بۆ گەشەی ئاگاداری ئەو لە جیهان دەبێ کەم بوونەوەی مەترسی و کەندو کولۆ وبەرفرەیی هێمنایەتی و حەسانەوە و خاترجەمی لەگەڵ بێ. جا بائێستا بزانین بەراستی وایە؟

بەراستی بشێوی وکەندو کۆسپ وگرێ و دژواری و خراپە..لەدونیای ئیمرۆدا (کەبێ شک علموزانست لە پێشوو زۆر پێشکەوتووترە ) لە رابردوو کەمتربووەتەوە و دانیشتوانی سەر زەوی لە باب وباپیرانی خۆیان پتر هەست بە هێمنی و خاترجەمی دەکەن ؟

سەیربوونی دەوری عیلم لێرەدا بەجوانی وەدیار دەکەوێ. کاتێک بیر لە پێشکەوتنی مرۆڤ لەسەر ناسینی خاشەی نەخۆشی یەکان و دۆزینەوەی چارەودەرمانی ئەوان دەکەینەوە یا ئەو دەمە کە گیروگرفتی هات و چۆوپێوەندی وتەفریحی باب و باپیرانی خۆمان بۆ دەبێتە فکر دەتوانین لە وەڵامی پرسیارەکانی سەروودا ، بڵێین (ئا) ودان بەشوێن و دەورئیجابی زانست لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەشەردا بێنین بەڵام ئێستا ئەم بیروفکرە نەبووەتە بریار چون کەند وکوسپێکی زۆر لەبەرچاوی عەین و زەینی ئێمەدا ریز بوونەوەهەژاری و برسیەتی وروت وقووتی و کۆیلەتی فەرهەنگی وئابووری وسیاسی زوربەی دانیشتوانی سەرگۆی زەوی ناچارمان دەکا بڵێین (نا) وبۆ لە کارهێنانی راست وبەجێی زانست لە کۆمەڵگای بەشەری دا هانمان دەدا.

ئێستا چ بڵێین ؟ ئەم جیاوازی یە وناکۆکی یەچۆن چارە بکەین ؟

واوێدەچێ لە باسەکانی رابردوودا وەڵامی ئەساسی ئەم گرفتەمان وەدەست کەوتووە چون گوتمان زانست

# ئەدی چۆنە دیسان دەسەڵاتی پۆلێک ساماندار و بێ دین و زاڵم هەر ماوە

وەک کەرەستەیەک دەتوانێ هێزوتوانستی مرۆڤ زیاد بکا و لە بەڕێوەبردنی کاری گەورە و ئەستەمدا یارمەتی بدا وئەمدەرفەتەی کەپێشان بۆی نەڕەخسابوو پێک بێنێ.کەچی قەزاوەت لەسەر بەرهەمی کەلک وەرگرتن لەزانست بەپێی کەرەستەبوون وخولقاندنی هێزوتوانست و نەگرتنی لانێکی تایبەتی مەحالە، کەوابوو دەبێ پێشان روون بکرێتەوە کەبڕشت و توانستی پێشکەوتی زانست بۆ کێ یە؟ یا کەرەستەی زانین بەدەست کێوەیە؟

بێ شک هەرکات زانست لەخزمەت چارەسەری گیرو گرفتی ئینسانەکان بووبێ بەرهەمی باشی لێ وەرگیراوە و گرێ پووچکەی کاری مرۆڤی کردۆتەوە بەڵام بەداخەوە توانستی بەربڵاو پێشکەوتووی زانست و تکنۆلۆژی لەجیاتی ئەوە کەهەموو خەڵکی جیهان کەلکی لێ وەربگرن بۆ دەستەیەکی بێ ئیمان و نائینسان تەرخان کراوە و بووەتە کەرەستەیەک بۆ گەیشتن بەویست و داوای چەپەڵیان.

باچاوێک بە دونیادا بگێڕین تا بۆمان دەرکەوێ لە بەرامبەر هیندێک خاوەن هێزو دەستەڵات زۆر بێ بەش ورووت و برسی هەن کە هەموو حەول و دەولیان ئەوەیە کە پارووە نانێک بۆ خۆماڵ ومندا-لیان دابین بکەن(هەڵبەت ئەگەر ماڵێکیان هەبێ)

بەراستی شتی وادەبێ؟

ئاخر چۆن دەبێ چەند کەس چارەنووسی دونیا بەدەستەوە بگرن ولەگۆڕەپانی جیهاندا حوکماتی بێ سنوور و بێ بڕانەوەیان ببێ؟

ئاخر لە رابردووشدا خەڵک هەمیسان کۆیلە و ژێر دەستی سوڵتان و پاشای زاڵم بوونە. بەڵام کورتە سەرنجێک ئەوە زوون دەکاتەوە کە نەزانی و هەژاری فەرهەنگی لەلایەک ونەبوونی پێوەندی لەنێوان چین و توێژەکانی جۆراوجۆری کۆمەڵ لە لایەکی دیکەوە دەرفەتی دەسەڵاتداری شا گەلێکی پێک هێناوە کە زۆرجار بێ سەوادونەزان و نەلایق بوونە. بەڵام ئیمڕۆ تەنەوەی دەنگەوەرەی خەبەری و پێوەندی تەواوی دونیای لێک ئاگادار کردووەوخەڵک لەچاو پێشوو زۆر زاناتر و ئاگادارترن و زانستی سیاسی شیان کامیل ترە.

ئەدی چۆنە دیسان دەسەڵاتی پۆلێک ساماندارو بێ دین و زاڵم هەروا ماوە؟

خۆ ئەگەر بیروڕای پڕ و پووچ وبێ مانابوونی شاگەلێکی بەسەر خەڵکدا دەسەپاند و کەم بوون و نەبوونی رادەی گەشەی بیروڕای کۆمەڵایەتی ماوەی تووڕەیی وتۆسنی ونارەزایی نەدەدا ولەولاشەوە سەرهەڵدانی رێکخراوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەمەبەستی بەدەستەوەگرتنی هەموو کار وباری چەوساوەکان لەلایەن ئەوانەوە نەدەلوا، ئەدی ئێستا چۆن دەکرێ باوەڕ بەحاکمەتی بێ ئەم لاو ئەولای حاکمە زاڵمەکانی هەموو دەوروزەمانان بەسەر چەند میلیارد خەڵکی دونیابکەین؟

**درێژەی هەیە**

ضمن سلام به خوانندگان عزیز امروز که با هم سخن میگوئیم جهان در غوغایی بس بزرگ بسر میبرد. غوغایی کەابعاد آن اینک

اقصی نقاط دنیا را فرا گرفته است . غوغایی که کنترل آن دیگر از دست برپاکنندگانش خارج گشته است . بررسی ابعاد ، کیفیت وعوامل این غوغا نه کار ماست ونه دراین مقوله میگنجد لکن درحوزه بحث خود مایلیم در باره نقش عجیب علم در دنیای پرغوغا ویا بهتر بگوئیم نقش عجیب علم در غوغای دنیا بحثی هرچند کوتاه داشته باشیم. قبل از ورود به بحث لازم است یادآوری کنیم که مقصودمان ازعلم دراین گفتار صرفا" علوم تجربی وفیزیکی است .اینکه میگوئیم عجیب به خاطر اینست که امروزه شاهد نقش دوگانه وبلکه متناقضی از علم درزندگی انسانها هستیم .بدیهی است دانش بشری درکوران مبارزهٔ او با مظاهر سرکش طبیعی و بهمنظور تسلط هرچه بیشتر برجهان هستی پدید آمده تا از تهدید مظاهر قهرش درامان بماند و ثانیا" بااستفاده ازقوانین شناخته شده و نیز کشف قوانین پنهان وناشناخته بتواند طبیعت را مسخر فرمان خویش کرده وبروفق مرادش ازآن بهره جوید. بدین ترتیب علم بشر بهمجموعه دانستههایش از قوانین جهان آفرینش و روشهای کاربردی این قوانین اطلاق میشود. براین اساس پیشرفت آدمی در تکمیل دانستههایش ازجهان لزوما" باید با کاهش مخاطرات و ناملایمات وافزایش امنیت آسایش ورفاه در زندگی همراه باشد.

اکنون باید دید که آیا واقعا" همینطوراست ؟ آیا واقعا" ناامنی ، کاملا" ملموس میشود.وقتی به پیشرفت بشر درشناخت ریشه بسیاری ازبیماریها و کشف روشهای درمان آنها میاندیشیم، یا وقتی کهبه مشکلات تردد،ارتباط،تفریحات و...آدمی در گذشته فکر میکنیم جهت میابیم تابه سوالات فوق پاسخ مثبتداده و بطور مطلق به تاثیر مثبت علم درزندگی اجتماعی بشر اعتراف نمائیم. اما

**بدین ترتیب علم بشر بهمجموعه دانستههایش از قوانین جهان آفرینش و روشهای کاربردی این قوانین اطلاق میشود.براین اساس پیشرفت آدمی در تکمیل دانستههایش از جهان لزوما" باید با کاهش مخاطرات ونا ملایمات وافزایش امنیت ،آسایش و رفاه در زندگی همراه باشد.**

ناملایمات ، سختی ها ، فقر تباهی و... درجهان امروزی که درپیشرفت علمی آن نسبت بهگذشته هیچ جای تردیدی نیست) کمتر از گذشته بوده و آیا مردم جهان امروز بیشتر از گذشتگان خود در آسایش وامنیت بسر میبرند؟ عجیب بودن نقش علم در اینجا هنوز این اندیشهبهتصمیمی جدی تبدیل نشده که نابسامانیهای فراوانی به سرعت از جلوچشم عین و ذهن رژه مبروند و توجه به فقر، گرسنگی،برهنگی، مظلومیت واسارت فرهنگی اقتصادی،سیاسی ، اکثریت انسانها در کره خاکی سریعا" آدمی را به دادن

# چگونه سیطره مشتی سرمایه‌دار و ملحد و ستمگر ممکن گشته است

رای منفی نسبت به‌کاربرد مثبت علم درجامعه‌انسانی ترغیب مینماید. راستی چه باید گفت؟ این تناقص چگونه حل شدنی است؟... به‌نظر میرسد در بحثهای گذشته به‌پاسخ اساسی برای این مسئله دست یافته‌ایم.

گفتیم که علم چون ابزار میتواند قدرت بشر را افزایش داده و او را درانجام اقدامات بزرگ و بسیار مشکل یاری کرده و تحقق شرایطی را که در گذشته ناممکن بود، ممکن سازد.

قضاوت وپیش‌بینی نتایج بهره‌برداری از علم بنا به خاصیت ابزاری وقدرت‌آفرینی علم وبه دلیل اینکه ذاتا" ازهیچ جهت‌خاصی برخوردار نیست امری غیرممکن است بلکه باید دراین رابطه روشن گردد که‌قدرت حاصله از پیشرفت علم به چه کسانی تعلق دارد و به تعبیر دیگر ابزار علم مورداستفاده چه افرادی قرار میگیرد؟روشن است که هرگاه ازعلم درراه‌حل مشکل انسانها استفاده شد نتایج مثبتی بدست آمده و گره ازکار آدمهاگشوده گشت. لکن متاسفانه‌قدرت عظیم ناشی از پیشرفت علوم و تکنولوژی به‌جای آنکه متعلق به عموم جامعه جهانی انسانها باشد دراختیار عناصر فاقدایمان وهویت انسانی قرار گرفته وبه‌وسیله‌ای برای تحقق اهداف شوم وپلیدشان مبدل گشته است. وقتی که به جهان مینگریم میبینیم که دربرابر تعداد معدودی از صاحبان قدرت و مکنت اکثریتی محروم یا گرسنه‌و برهنه هستیم ویابا تلاشی جانفرسا همه هم و غمشان این است که قوت خود و اهل بیت را (اگر بیتی باشد) فراهم سازند. راستی چگونه چنین چیزی ممکن است؟یعنی چگونه میشود که گروهی اندک سرنوشت جهان را رقم زده و در عرصه جهانی حکومتی بلا منازع داشته باشند؟

البته درگذشته نیز مردم همواره دراسارت سلاطین و شاهان ستمگر بوده‌اند. لکن یک بررسی ساده نشان میدهد که جهالت و فقر فرهنگی ونیزموانع ارتباطی بین واحدهای اجتماعی امکان تسلط شاهانی را فراهم میکرد که گاه خود بی سواد وفاقد مدیریت سیاسی (هرچنددرجهت باطل) بوده‌اند. اما امروز که امکانات ارتباطی و خبری به‌نحوی گسترده تمامی نقاط جهان رابه‌هم پیوند داده‌و مردم به‌طور نسبی ازنقطه نظر اطلاعات عمومی و دانش سیاسی با گذشتگان تفاوت بسیار پیدا کرده‌اند چگونه سیطره‌مشتی سرمایه‌دار ملحد وستمگر ممکن گشته است؟ به‌عبارت دیگراگر درگذشته خرافات واندیشه‌های واهی ضرورت وجود شاهان را برافکار اجتماعی تحمیل میکرد واگر نازل بودن سطح آگاهیهای سیاسی و پائین بودن درجه رشد اجتماعی امکان ظهور روحیه گستاخی وپرخاشگری واعتراض و نیز بروز تشکلهای سیاسی - اجتماعی بمنظور تلاش در راه بدست‌گرفتن زمام‌امورا درمستضعفین منتفی میساخت، امروزه چگونه میشود سلطه بی‌چون وچرای ستمگرترین حکام‌همه اعصار و قرون را بر جمعیت چند میلیاردی دنیا باور کرد؟

**ادامه دارد**

کاتێک سارا خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم تێگەیشت کە مندالّی نابێ داوای لە ئیبراهیم کرد کە "هاجەرە" بخوازێ بەڵکوو خودا مندالّێکی بداتێ .

پاش سالّێک هاجەر کوڕێکی بوو کە ناویان نا ئیسماعیل . باوکی تامەزرۆی وەجاغ رۆژ لە رۆژ زیاتر خۆشەویستی خۆی دەخستە سەر کوڕەکەی و ئەو کارە دەبووە هۆی ئێرەیی و حەسوودی سارا . سارا کە خۆی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلی هان دابوو لەگەلّ هاجەر زەماوەند بکا ئەوجار دەستی کرد بە شەڕهەلّایساندن و تەوس و پلار هاویشتن و ئازار دانی ئیبراهیم و هاجەر. بەوجۆرە ئاسایش لە مالّی ئیبراهیم کۆچی کردوژیانێکی تالّ و ناخۆش دەستی پێکرد.

ئیبراهیم کەرێگا چارەیەکی دەویست دەستی نیازی بەرەو پەروەردگار بەرزکرد و دەستی بە پاڕانەوە کرد. لە لایەن خودای گەورەوە ئیلهامی بۆ هات کە " ئەی ئیبراهیم سەبوور بە کە ئێمە پیاوی سەبوورمان خۆش دەوێ.زۆر بوون ئەو پێغەمبەرانەی کە پێش تۆش لەدەست ژنەکانیان جاڕز بوون ."

**ئیستا هاجەر و ئیسماعیل سـواری وشتر کە وبەو بیابانە قاقڕەدا وەڕێ کەوە. هەر بڕۆ تا وشتر بۆخۆی رادە - وەستێ. ئەمجار لەگەڵ سارا و ئیسماعیل ماڵاوایی بکە و بگەڕێوە وڵاتی خۆت .**

ئیبراهیم کە دڵی لە ئەوینی کۆرپەی ساوا و هاجەر کە لەوە رێز بوو سەری بۆ فەرمانی خودا دانەواند و ماڵاوایی لێکردن و کوتی :

**" رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ . رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَوٰةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ "**

هاجەر و ئیسماعیل لەو بێروونە بەرەهووتەدا ، لەسەر رەملی داغ و لە ژێر قرچەقرچی گەرمادا بێ ئاووخواردەمەنی، رۆژو شەویان رابوارد. توونیەتی و برسیەتی بەسەریان دا زاڵ بوو. سارا بۆ چۆڕێک ئاو بۆ کۆرپەکەی کەوتەپەلەقاژەو هەوڵ دان بەڵام هەرلایەک رووی تێدەکرد هەر تراویلکە بوو. ئاو لەهیچ جێگایەک دەست نەکەوت .

سمایلی تینوو گرووی ئاوی گرتبوو لاقەکانی دە عەرز دەکوتا وهاواری دەکرد دێوەزمەی ناهومێدی بەسەر سارادا زاڵ ، ببوو کە لە نەکاو گریانی سمایل وەستا و سارا وەخۆ هاتەوە و دیتی لە ژێر پانیەی سمایل دا ئاوێک هەڵقوڵیـوە . کانی یەکی روون و ئاوێکی فێنک کە پاشان ناویان نا ئاوی زەمزەم.

هەڵقوڵینی کانی یەکی ئاوا فێنک وجوان بوو بەهۆی داوەرووکانی تەیر و توور و جانەوەر وئینسان و زیندەوەری دیکە. عەشیرەتی (جورهوم) لە نیزیک کانی نیشتەجێ بوون و ئەو بیابانە قاقڕە وردە وردە ئاوەدان کراوە.

کاتێک سمایل تەمەنی منالی دەبردە سەر ، حەزرەتی ئیبراهیم جاروبارسەرێکی لێدەدان و چاوی بە دایک و کوڕ دەکەوت ، ئەوین وخۆشەویستی ئەولاد ، تەواوی گیان و لەشی ئیبراهیمی داگرت تا ئەو جێگەی کە فکر وزیکری هەر کوڕەکەی بوو . لە نەکاو فەرمانێکی ئاسمانی لە لایەن خوداوە گەیشت "

**" ئەی ئیبراهیمی خەلیل ئیرادە و ڕای ئێمە لەسەر ئەوەیە کە ئیسماعیلی کوڕت**

لە ڕێگەی ئێمەدا قوربانی کەی."

ئیبراهیم بە پەشۆکاوی لەخەو ڕاپەڕی. فەرمانی خودایە و چی دەگەڵ ناکرێ. ڕووداوەکەی بۆ هاجەریش گێراوەوئەمری کرد کە ئیسماعیل بە جوانترین جل و بەرگ بڕازێنێتەوە و سەروکاکۆڵی بەشانە کاوو عەتری بۆن خۆشی لێ بداوئامادەی قوربانی کردنی بکا، پاشان بۆ بەڕێوە بردنی فەرمانی ئیلاهی دەستی داخەنجەرو دەستی ئیسماعیلی گرت وبەرەو قوربانگا کەوتە ڕێ.

پاش پێوانی مەودایەک گەیشتنە ئەو جێگایەی کە ئەمڕۆ"**مەنا**"ی پێدەڵێن و مزگەوتی شکۆداری حەنیفە لەوێ دروست کراوە. ئیبراهیم کە نوقمی گەرداوی خەیاڵی ئاڵۆزو پاڵۆزی خۆی بوو لە کاتێکدا چاوی لە چاوە جوان ومەعسوومەکانی سمایل بڕیبوو فەرمانی خودای پێ ڕاگەیاند.

سمایل بە ورەی بەرزەوە ئامادەیی خۆی بۆ قوربانی کردن لەڕێگای خودا دەربڕی و ئیمانی خۆی بەخودای تەنێ و پێغەمبەرەتی باوکی خۆی ڕاگەیاند.پاشان دەستووری بە باوکی دا خۆ ڕاگر بێ و دەست و پێ ون نەکا وبۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی خودا پەلە بکا.

ئیبراهیم بەپەلە دەست بەکار بوو. بە دەستی لەرزۆکەوە خەنجەری تیژی لە سەر گەردنی ناسکی سمایل دانا و ناوی خودای هێنا، شەیتان سێ جاران ویستی ئیبراهیم وەسوەسە بکا ونەهێڵێ سمایل قوربانی کا بەڵام سەر نەکەوت (ڕەجمی شەیتان وەبیرهێنەوەی ئەم ڕووداوەیە) خەنجەری بە هەموو هێزی خۆی داگرت بەڵام بەسەر سوڕمانەوە دیتی کە خەنجەر وەک بە بەردی خارایدا بێنی نابڕێ و کولە. زۆری هەوڵ دا بەڵام سوودی نەبوو

سەری هەڵێنا و لە خودا پاڕاوە کە یارمەتی بدا. لە نەکاودەنگی جبرئیلی ئەمین بەگوێی گەیشت.

" ئەی خلیل اللە تۆ وئیسماعیلی کورت نیشانتان دا کە گوێ لەمستی فەرمانی خودان. ئەو لەخۆ بووردنەتان لێ

پیرۆز بێ. حەق تەعالا دەفەرمووێ "ئێمە
بێجگە لەرەحمەت هیچ شتێکمان بۆ
بەندەکانی خۆمان ناوێ. ئێمە لەبەرەی
مرۆڤ تەنیا مرۆڤایەتیمان دەوێ نە
کوشتنی یەگدی ، هەستە ئەو بەرانە
سپی بەڵکە لەجیات سمایل بکە بە
قوربانی و گوشتەکەی لەنێو فەقیران
دابەشەوە تا ئەو سەدەقەیە لە لایەن
خوداوە قەبووڵ بکرێ. ئەی ئیبراهیم
بە پاسی ئەو تەسلیم ورەزایە لە
تۆرەمەی سمایلی کوڕت پێغەمبەرێک دێتە
سەر دنیایە کە وەک تۆ موسوڵمان وخودا
ناس دەبێ. ئەو لەگەڵ ئۆمەتەکەی زۆر
قوربانی لە رێگەی ئێمەدا دەدەن وئەم
جێگایەش کە ئێستا تۆ لێی راوەستاوی
دەبێتە جێگایەکی پیرۆز وموقەددەس ."

لە ژیانی ئەمڕۆی مرۆڤدا ئەو رۆژە
وەک یەکێک لە رۆژە پیرۆزەکانی
ژیانی مرۆڤ لەدرێژایی مێژوو دێتە ژمار
ئەو رۆژە جێژنی هەموو موسوڵمانانی
جیهانە و بەناوی جێژنی قوربان ناودێر
بووە. حاجی یەکانی سەرانسەری جیهان هەر
لەو جێگایە قوربانی خۆیان پێشکەشی
بارەگای خودا دەکەن .

خودای مەزن ئەو جێگایەی بە حەرەمی
ئەمنی خۆی داناوە. لێرەدا نابێ خوێن
برژێ و گیاندار وئینسان بکوژرێ.

بەڵام دەرد وداخ لە بەرێوەچوونی
حەجی ئەمساڵ دا (۱۴۰۷)(ق) ئەو حەڕەمە
ئەمنە بەخوێن سوور کراو ئیستیکباری
جیهانی وداروودەستە بۆ ئیرادەکەی یانی،
بنەماڵەی سعوود ئەو حەریمەیان شکاند.
کەعبەی پیرۆز بە خوێنی زیاتر لە ۴۰۰
حاجی ئێرانی و غەیرە ئێرانی خوێناوی
بوو. ئەوەش لە کاتێکدا کە حاجی یەکان
دروشمی مەرگ بۆ ئەمریکا وئیسرائیل و
شووڕەوی یان دەدا وبەڕائەتی خۆیان
لە موشریکان دەردەبڕی.ئێمەش وەک هەموو
موسوڵمانانی جیهان خەلعییەدی بنەماڵەی
سعوود لەحەڕەمەینی شەریفەین داواکارین.

# تەرجەمە

وێڕای سپاس لە عەزیز کەیخوسرەوی

## موحەممەدی قازی

تەرجەمە یا وەرگێڕان کارێکی گرینگ و ئەساسی یە . وەرگێڕ وەختێک لە کاری خۆیدا سەردەکەوێ کە بتوانێ حەوت ئەسڵی خواروو لەبەرچاو بگرێ . لەبەرچاو نەگرتنی هەر یەک لەم ئەسڵانەدەبێتە هۆی ئەوە زەبرێک وەوەرگێڕانەکەی بکەوێ .

**الف - مەبەستی مەتنە ئەسڵی یەکە بگەیەنێ .**

**ب - راوێژی زاری نووسەر بپارێزێ .**

**ج - زمانی تایبەتی مەتنەکە بدۆزێتەوە .**

**د - وشەی راست و بەڕێ و جێ و لەزاران خۆش هەڵبژێرێ.**

**هـ - رێزمان لە مەتنی وەرگێڕاوەکەدا لەبەر چاو بگرێ .**

**و - کورت ودرێژی رستە و بۆچوونەکانی نووسەربپارێزێ.**

**ز - نوختە وجێگەی نوختە دانان لەبەرچاو بگرێ .**

جابا ئێستا بزانین مەبەستلەم حەوت باسە چیەو بە نۆبەهەریەکە لەوان شی بکەینەوە .

الف: روونە کە **وەرگێڕ دەبێ ئەو زمانەی وەریدەگێڕێتە سەر زمانەکەی خۆی، ئەوەندەی تێدا شارەزا بێ کەلەبابەت و مەبەستەکانی بگا و وردە ئیشکالیش لە فەرهەنگ یالای ئەوکەسانە** کەزمانەکە لەو باشتر دەزانن حەل بکا بەکورتی **وەرگێڕ دەبێ مەبەستی نووسەری ئەسڵی بزانێ و وەک خۆی وەری بگێڕێتەوە نەک ئەوە وەرگێڕاوەکە بە پێچەوانەی قسەی نووسەر بێ و مەبەستی ئەو نەگرێتەوە .**

ب : **راوێژی زاری نووسەر بپارێزێ** .نووسەر بە پێی سروشتی خۆیان راوێژی جۆراو جۆریان هەیە . من زۆرتر ئەو نووسەرانە دەناسم کە کارەکەیانم بە فارسی وەرگێڕاوە بۆیە وێنە لەوان دێنمەوە .

**نیکۆس کازانتاکیس** نووسەری یۆنانی شۆخ ،و قسە خۆشە ونووسراوەکانی پڕن لەقسەی خۆش وبەتام وخوێ. بۆ ئەوە کە ئەوقسەتان بۆ دەرکەوێ کتێبی **" ئازادی یا مەرگ "** **"مسیح بازمصلوب"** **و "زوربای یۆنانی "** (کەمن وەرمگێڕاونەوە) بخوێننەوە .

**ئەناتۆل فرانس** نووسەرو فەیلەسۆفی فەڕەنسەیی تەنز نووس وناسک هەستە . ئەوم لەکتێبی **"جزیرە پنگوئن ها"** کەکردمە فارسی بۆدەرکەوت کە تەنزی توندوتیژ دەنووسێ ئەوەی کاری ئەم چەشنە نووسەرانە وەردەگێڕێتەوە دەبێ لە وەرگەڕاوەکەدا ئەم شیرن زمانی یا وشک وڕەقی یا تەنزوێژی و فرەهاوێژی نووسەرەکەی لەبەرچاو بێ . دەنا ئەگەر هەموو بابەتێک وەک یەک تەرجەمە بکرێ و خوێنەر تەنیا بە روانینی بەرگی کتێبەکە نووسەرەکەی بناسێ وەرگێڕاوەیەکی سەرکەوتوو نابێ و وەک ئەوە دەچێ کە هەموو کاری نووسەر- ێکن .

بۆوێنە **فەرموو ، دانیشە ، داتووکە***، هەرسێک یەک مانان

بەلام گوتنەکەیان فەرق دەکا .
**فەرموو** بۆ ڕێز و تەعاروف دەبێ. **دانیشە** حالەتی خۆمانە وئاسایی هەیە.
**داتۆوکە*** نیشانەی تەشەر و سووکایەتی یە.
ئێستا **ئەگەر** وەرگێڕی شوێنەواری نووسەرێک هەرکام

یانووسرا – وەکانی **جەمالْ زادەو جەلال** ئال ئەحمەد یەک نیە. ئێستا ئەگەر وەرگێڕێکی فەرەنسەیی یا ئینگلیسی **"تاریخ بیهقی"** **یاگلستان سعدی"** هەر بەو زمانە وەرگێڕێتەوە کە بەرهەمەکانی **جەمالْ زادە** و

لەم وشانە بەڕێ وجێ وپڕ بەپێستی خۆیان لەکار نەکا ئەودەم ڕاوێژی زارومەبەستی نووسەری ڕانەگەیاندووە .

**ج – زمانی تایبەتی دەقی نووسراوەکە بدۆزیتەوە.**

نووسەرێکی وەک **بۆکاچیۆ** ،نزیک بەشەشسەت وپەنجا ساڵ لەمەوبەر ژیاوە یا **سروانتس** چوارسەت ساڵ بەر لەئێمە بووە. زمانیان لەگەڵ ئێمە جیاوازی هەیە. هەروەک زمانی **"تاریخ بیهقی"** لەگەڵ زمانی **" تاریخ مشروطیت "**

هیدایەتی پێ وەرگێڕاوە، حەتمەن سەر ناکەوێ .

دیسان لەکارەکانی خۆمکە زۆرتر لەگەڵیان شارەزاموێنە دێنمەوە.

بایەخی شێوە وەرگێڕانی **"دن کیشوت"** یا **"دکامرون"** – ی من لەوە دایە کە **توانیومە زمانێکی نزیک بە زمانی نووسەرەکەیان بدۆزمەوە**.ئەگەر **پێم نەڵێن خۆهەڵکێشە دەڵێم کە ئەو مەبەستە یەکێک لەهۆیەکانی سەرکەوتنی منە و بەبڕوای**

**هێندێکان وەرگێڕاوەکە لە ئەسڵەکە نزیکترە.**

**د – وشەی ڕاستوبەڕێ و جێ ولەزاران خۆش هەڵبژێرێ.**

ڕەنگە وشەیەک چەندمانای هەبێ یاچەند شێوەی جۆرا و جۆری ببێ. وشە وەختێک ڕاست بەکار هاتووە کە مانای دڵخوازی نووسەری گەیاندبێ . بۆ وێنە وشەی **"سۆرس"** هەم بەمانای **کانی** یە وهەم بەمانای **سەرچاوە** و **مەنبەع**. دەبێ وەرگێڕ بزانێ مەبەستی نووسەر کام مانایە یاوشەی **"گرناد"** هەم بە مانای **هەنارە** و هەم بە مانای **(نارنجۆک)** هەنار دەخورێ و**نارنجۆک** پیاو دەکوژێ .

وەرگێڕ دەبێ زۆر ورد بێ کە نەکا بەجێی هەنار وشەی **نارنجۆک** دابنێ یابەپێچەوانە.
( من وەرگێڕێک دەناسم ئەو کارەی کردبوو)

وشە وەختێک بەڕێ وجێ و لە زاران خۆش دەبێ کە وەرگێڕ لەنێو چەند ماناوشێوەدا **هەرە** خۆشڕاوێژیان هەڵبژ – ێرێ. بۆ وێنە وشەی **"فیگور"** بەمانای **ڕوو ،ڕوخسار دەموچاو ، فەلاقەت و .....** هاتووە هەمووش هەر یەکن یاوشەی **"تریست"** بە مانای **خەمگین پەرۆش ،دلگیراو ، خەمناک ،بەپەژارە** و ..... هاتووە ،وەرگێڕی خۆش زەوق ئەو کەسەیە کەلەم وشانە

ئەوەی لەگەڵ مەتنی وەرگێڕا
ـ وەکەی ڕێک دەکەوێ
هەڵبژێرێ. بە هەرحاڵ ئەو
باسە بەستە بە زەوق و

مرخی وەرگێڕە و وەرگێڕی
خۆش زەوق وبە تایبەتی
**شیعرناس** لەموردەکاری یانەدا
سەرکەوتووترە.

هـ : **ڕێزمان لە دەقی وەرگێڕاوەکەدا لەبەر چاو بگرێ.**

ئەمە روونە کە مەرجی
سەرەکی ڕاست بوونی ڕستەیەـ
کی فارسی وهەموو زمانێک
لەبەرچاو گرتنی ڕێزمانی
ئەو زمانەیە. بۆ وێنە لە
فارسیدا زەمیرىسێهەمکەسی
تاک بۆ شت وەک "آن"ە وبۆ
کەس "او". وەختێک ،
کۆبکرێنەوە ئەویان دەبێتە
"آنها" وئەمیان "ایشان"
یا "آنان". ئەوەش دەزانین
کە سیفەت و مەوسووف
جێگەیان وەک زمانی فەڕەنسە
نیە. هەروەها ژمارەکان. ئێمە
دەڵێین "مردان دانا" بەڵام
فەڕەنسەیی دەڵێن "مردان
دانایان" یا ئێمە دەڵێین
"پنج مرد" ئەوان دەڵێن
"پنج مردان"

**وەرگێڕ دەبێ ڕێزمانی خۆی لەبەرچاو بگرێ ولە شێوەو ڕێبازی ئەو زمانە کە نووسراوەکەی پێ نووسراوە پەیڕەوی نەکا.**

**٦- درێژ دادڕی وکورت بڕینەوەی نووسەر لەبەرچاو بگرێ.**

ئەوەش روونە. ئەگەر
نووسەر مەبەستێکی لەدێڕێکی
کورتدا بڕیوەتەوە وەرگێڕ
دەبێ لاسای بکاتەوەو ئەگەر
هەستی بەوە کرد کەدەبێ
پتر شی بکرێتەوە دەتوانێ
لە پەراوێزدا باسی بکا.
یا ئەگەر نووسەر مەبەستێکی
لەچەند ڕستەی دوور ودرێژدا
باس کردووە وەرگێڕ نابێ
درێغی بکا. لەبەرچاونەگرتنی
ئەم ئەسڵە دەبێتەهۆی ئەوە
کە وەرگێڕاو لەگەڵ نووسراوە
چەند لاپەڕە کەمتر یا زۆرتر
بێ کەئەوەش باش نیە.

بەکورتی ئەگەر نووسەر
وشەی "**بیابان**ی هێناوەتەوە
پێویست ناکا ئێمە "**بێروون**"
یشی رەگەڵ بخەین.

**٧- بایەخ بەنوختەدانان بدا.**

نووسەری قەدیمئەوباسەیان
لەبەرچاونەدەگرت. ناسینەوەی
ئاخری ڕستە زۆر دژوار بوو.
پیاو نەیدەزانی ئایا ئەم
دێرە لەیەکی دیکە وەرگیراوە
یا گوتەی نووسەرەکەیە ،
پرسیاری یە، یا ...

لەو دەمەدا کەئێمەشارەزای
ئەدەبی ڕۆژئاوا بووین فێری
نوختەدانان بووین. جاکەوا
بێ دەبێ نوختەیئاخری ڕستە
ونیشانەی پرسیار (؟) ونیشانەی
سوڕمان (!) یاویرگول (،) یا
لە گیوومە" "نانی نەقڵی
قەول هەر بەم شێوە کەنووسەر
کردوویەتی لەبەرچاو بگرین
تاخوێندنەوە وتێگەیشتنی
ساناتر بکەینەوە.

لەم باسە بەوە دەگەین کە
**هەموو ئەم قاعیدە ورێ و شوێنانەی تەرجەمە بۆ لەبەر چاوگرتنی دووئەسڵی بنەڕەتیـیە.**

**یەکەم: دۆزینەوەی مەبەست و پەیامی وەرگێڕاو.**

**دووهەم: دۆزینەوەی شێوە و ڕێبازی نووسەرە.**

**سەبک وڕێباز ، ڕاوێژی ئاخاوتن وتەنزی زمان و دۆزینەوەی وشەی بەڕێ وجێ وکورت ودرێژ و لەبەرچاو گرتنی ڕێزمان و نوختە دانانیش دەگرێتەوە.**

**روونە کە وەرگێڕ دەبێ ئەو زمانەی وەریدەگێڕێتە سەر زمانەکەی خۆی ، ئەوەندەی تێدا شارەزابێ کە لە بابەت و مەبەستەکانی بگا و وردە ئیشکالیش لای ئەوکەسانە کە زمانەکە لەو باشتر دەزانن حەل بکا. بە کورتی وەرگێڕ دەبێ مەبەستی نووسەری ئەسڵی بزانێ و وەک خۆی وەری بگێڕێتەوە نەک ئەوە وەرگێڕاوەکە بە پێچەوانەی قسەی نووسەر بێ و مەبەستی ئەو نەگرێتەوە.**

" **پیرۆز** " یەکێک لەو وشانەیە کە لە زمانی کوردی دا زۆرجار بە هەڵە بەکاری دەبەن وبەداخەوە ئەو هەڵەیە لەچاپەمەنیەکاندا دەبیندرێ ولەدەنگ و رەنگیشەوە دەبیسترێ . هۆی ئەو هەتڵەبوونە بە رواڵەت نزیک بوونی وشەی "پیرۆز"ی کوردی یە لەگەڵ " **پیروز**"ی فارسی .

بناغەی وشەی "**پیرۆز**" لە زاراوەی ئەوێستایی دا کە زاراوەیەک لەزمانی **مادی یە** دارێژراوە .

لە **ئەوێستاییدا** ئەووشەیە "**پەیتی رەئوچە** بووە کە لە دوو وشەی "**پەیتی** " بەمانای هاتنەخوار و"**رەئوچە**" بە مانای هەتاو پێک هاتووە . کە لەسەر یەک ئیستلاحی " **هاتنەخواری هەتاو**"بەمانای "**موبارەک** "ە .

وشەی "**پەیتی رەئوچە**" لە زمانی پەهلەوی دا بۆتە " **پیرۆچ** " و لە زمانی ساسانی یەکاندا " **پیرۆج** " گوتراوە .

ئەو وشەیە لە زمانی فارسی ئێستادا بۆتە"**پیروز**" و لە زمانی کوردی دا "**پیرۆز**" دەگوترێ . وشەی "**فیروز**" عەرەبی کراوی وشەی "**پیروز**"ە

ئەمرۆ کە وشەی "**پیروز**" لە زمانی فارسی دا بە مانای "**سەرکەوتوو**" بەکار دێ وەک دەڵێن :" **من در امتحان پیروز شدم**" واتا "**من لە تاقی کردنەوەدا سەرکەوتم**" یا :"**انقلاب ما پیروز گردید**" واتا : "**شۆڕشی ئێمە سەرکەوت** " . ئەگەر ئەو دوو جوملەیەی ئاوا وەرگێڕینەوە :" **ئەمن لە تاقی کردنەوەدا پیرۆز بووم**" یان " **شۆڕشی ئێمە پیرۆز بوو**" دیارە دروست نیە و هەڵەیە .

لەرابردوودا "**پیروز**" ی فارسی جگە لە مانای سەرکەوتوو بەمانای **موبارەک کەلک وەرگر ، زاڵ** و **شادیش** هاتووە کە لە شیعری شاعیرانی رابردووی فارسیدا دەبیندرێ بەڵام وەک گوتمان ئەمرۆ تەنیا بە مانای "**سەرکەوتوو** " کەلکی لێ وەردەگیرێ .

لەزمانی کوردیدا وشەی "**پیرۆز**" بەمانای موبارەکە وەک دەڵێن :" **جێژنەت پیرۆز بێ**" یان :" **ئەم سەرکەوتنەت پیرۆزبایی لێ دەکەم**" . هێندێک کەس دەڵێن :... **پیرۆزباییت پێ دەڵێم** کەدیارە دروست نیە ووەرگێڕاوی ·"**تبریک میگویم**"ی فارسی یە .

دوای چاپ وبڵاوبوونەوەی کتێبی " **شاری وێران** " هاوڕێیەکی بەڕێزم رەخنەی گرتبوو کە بۆ وشەی "**تقدس**"م بەکار هێناوە و نووسیبووی وشەی " **پیرۆز**" پڕ بەهەنگڵیەتی . بەڵام ئەمن لەسەر ئەو بڕوایە نیم . وشەی تقدس **مصدری بابی "تفعل**"ە و لە وشەی " **قَدَسَ** " وەرگیراوەوبناغەکەی **قُدس** بەمانای (**پاک**)ە. بەڵام نەک هەر **پاک وخاوێن** . پاکێکی کە حاڵەتێکی رووحانی و ئاسمانی هەبێ. تا ئێستا ئەمن بۆ وشەی تقدس یان مقدس لەکوردی دا وشەیەکم بۆ نەدۆزراوەتەوە .

لەدوایی دا پێویستە بڵێم وشەی "**پیرۆزە** " کە بە فارسی "**فیروزە** " یان " **پیروزە**" دەگوترێ و بە مانای بەردێکی شین کاڵی قیمەتی یە و خەلک بە پیرۆز وموبارەکی دەزانن هەر لەوشەی " **پیرۆز** "ەوە وەرگیراوە .

# شەقڵی خەرمان

مستەفا شێخە

گەرمای بەتینی چلەی هاوین قرچەقرچی وەوپووشو پەلاشەی خستبوو کە لە وەرزی رابردوودا کەسک و گەش بوون و بە شنەبا دەشەکانەوە . مانگی خەرمانان،مانگی‌کۆکردنەوەی خەلەوخەرمان و بەرهەمی چەند مانگ کوێرەوەری و ئارەق رشتنە .

گاگێرە گوریسیان لەمل راکشا قەفی* جەلەی* لەبەر یەکەرەوینەوە، دەمبین لە دەمی مالاتی دا مالاّ،بەکەیفی خۆیان دەلەوەڕان، مانگا پیرەش شیری هاتەوە گوانی و دمەدۆی مندالان لەکیتەلە ودیزەلان دا هەوێن کراوە.

سۆفی غەفوور دوو رۆژ بوو بەشەنەوە چاوەڕوانی بای قوبلە بوو خەرمانەکەی لەبەر هەلاوێ.زریانێکی بەقەوەتی دەهات بەلام ئەو خەرمانەکەی بەبای قوبلەی شکاندبوو،هەر مالۆسکێکی مابوو دەرچێ .

هەموو رۆژێ لە رۆژئاوا بابنۆکەر بەخۆی وشەقلەوە سواری ماینی بۆرە دەبووو بە خەرمانەکان دا دەگەڕا یەک‌بەیەک شەقلی دەکردن و هەتا بەیانی بۆ خۆی نەیدیبانەوە کەس حەقی نەبوو دەستیان لێدا و ئالۆزیان بکات،گەیشتە ئ سۆفی غەفوور ، ماینە بۆرەی وەسەر سوّوری کرد و تێی راخوڕی :

ـ سۆفی ئەوە بۆ لەسەر ئەو تاقە مالۆسکەی خەرمانەکەت بە قوّون* داخستووە ؟

سۆفی مژێکی توندی لە سیغارەکەی دا بە چەشنێک دووکەلەکە وەکی هێزێکی زۆر پالی پێوەنێ لەهەموو سێ* یەکانی گەڕا و پاش ماوەیەکێ بە رەنگی گۆڕاو هاتەوە دەرێ. بە دەم دووکەل بەباکردنەوە وەلامی داوە :

ـ بەدشانسی من ئەوە دوو رۆژە بایەکەی گۆڕیوە.

ئەوەندی گوت و بیروخەیال هەلیانگرت‌نەیزانی کەنگێ خەرمان شەقل کرا و باب نۆکەر رۆیشت . پێش چاوی تاریک‌بوو دنیایەکی پرسیار هاتەپێش‌نەیدەزانی وەلامیان بۆ بدۆزێتەوە :

" ئاغا ئەو هەموو زەویانەی لە کێ کڕی و لە کوێ بوون ؟ ئەو خەلکە هەمووی دزە ئەوە نەبێ ..؟ ئەوشۆ هەلیکاتە بای قوبلەی ناتوانم ئەوەندە سوورەش وەدەرخەم، ئاخر ئەگەر بەیانی ئەو کابرایە بێتەوە دەلێ بۆ بە شەو هەلت‌هاویشتووە ، هەتا نیوەی بەریەوە مالێ و دەو دووی لێ نەدەی ؟ بۆسالێکی دیکە ئەوەندەشم دەچێ و دەریشم دەکەن،لەگوندێکی دیکەش هەر ئاوایە! ئاخ بۆ رۆژێ لەو کوێرەوەرییە رزگاریم بێ ! بلێی رۆژێک دابێ تاقانە کوڕەکەم دەستی داری بگرێ و راستو چەپی خۆی بناسێ ؟ ئەودەمی لەو ولاتەی دەرۆم و دەچمە ولاتێکی کەس نەناس ، بە گاوانیش بێ بەڕێوەم دەبات ."

لەو بیرانە دابوو بایەکە هەر دەمێ لە لایەکی را دەهات . بوو بە شەڕە با ، زریان دەهات شەمال دەی قۆستەوە و بای

قوبڵەی دەهات زریان بەگژی
دادەچوو. دەمێکی بایەکی
ڕاستی دەهات و د وایە
دەبوو بە گێژەڵووکە و
پووش وهەژگەڵی دەسووڕاند
و ڕەحەوای دەخست و لەبەر
چاوان ون دەبوو . ئاخری
بای قوبڵە هەڵیکردێ ،
بایەکی خۆش بوو هەودای
خەیالی سۆفی غەفووری
لەبەریەک پچڕی وگوتی :

ـ ئەگەر خەرمان شەقڵ
کردن نەبایە، هەر ئێستا
بە قەنەکێشێکی ئەوەندەشم
لەکۆڵ دەکردەوە. ئەوە بوو
لێڵ داهات ئەو ژنە پاروە
نانێکی بۆ نەهێنام .

لەو دەمی دا خێزانی لە
ڕێی ئاوایی وەدیار کەوت.
توورەکەی نانی لە کۆڵ
بەستبوو ودەستی کوڕەکەی
گرتبوو و وردە وردە ، بە
پێی وی نێزیک دەبۆوە و
گەیشتە جێ :

ـ خەرمان بەرەکەت ،
ماندوو نەبی پیاوەکە .

ـ " خێروبەرەکەتی
خوات لەگەڵ بێ ، جا بە
ناشکوری ناڵێم ماندوو
بوونی چی. ئەوە دوو ڕۆژەلە
سەر ئەو مالوسکە گەنمە
ماومەتەوە هەتا ئێستا بای
نەدەهات ئەلعانیش ئەوە
خەرمانەکە شەقڵ کراوە
نازانم بۆ وا دەکەن؟
کوێرەوەری چاندن و کێلان
ودروونەوە وهەموو شتێکی
بە ئەستۆی ئێمەیە
ئەوانیش هەر سوور وەدەر
کەوت دێن شەقڵی دەکەن و
ئەگەر هاتە خواردنێ نیوە
لەنیوەمان بۆ ناهێڵنەوە.
ئێستێ لەپێش تۆدا ئەو
باب نۆکەرە خوێڕی یە
مایینی وەسەر حاسڵی
زەحمەتی ئەوساڵم کردبوو .
وەخت بوو لە حەجمەتان*
بمرم. دەستەڵاتم نەبوو،
دەنا ئەگەر پارووی لەسووڕێ
گەنمی بادەدا و پێکۆڵی
لێ دەکرد، وامدەزانی پارووی
لە جەرگم بادەدا وسمکۆڵی
لێ دەکات ."

لەداخان هەموو تووکی
لەشی قرژ ببوون و پڕ بە
پێستی هەڵمسابوو. ئەگەر
سەری هەڵێنا تەماشای کرد
کوڕەکەی ئەوە گەمەی بە
سووری گەنمەکە دەکا وشەقڵ
و شوێنی تێک داوە . هەربەو
قین وڕقەوە کە لە داخی
ئەو هەموو زوڵمە هاتبووە
دڵی،دەستی شل کرد و هەتا
هێزی دەبەردابوو زللەیەکی
لەبناگوێیدا . کوڕەلاتڕەی*
بەست و ڕەتی برد و بەسەر
دمەداسێکی کۆن دا کەوت و
لاجانگی بەخوێن سوورهەڵگەڕا
کوێخا هات و شات وشووتی
دەس پێکرد کە بۆ شەقڵی
خەرمان شکاوە. بە هەزار
چەرمەسەری کوێخا دەست
بەردار بوو و ڕۆیشت .

سۆفی پاش ئەو ڕووداوە
دڵتەزێنە برینی لاجانگی
کوڕی بە بۆسۆ برژاندەوە.
پاش بەینێک لەو گوندە
ڕۆیشت .ئێستا پاش چەند
ساڵ کوڕ گەورە بووە وژنی
هێناوە و بۆتە گۆچانی
پیری باوکی . بەڵام هەر
چەند جار پیرەمێرد سەر
هەڵدەبڕێ و جێگا برینی
دمەداس لەسەر لاجانگی
ڕەنگ گەندوومی کوڕ دەبینێ
شەقڵی کوێخای دێتەوە بیرو
ئاخێک هەڵدەکێشی وتەریق
دەبێتەوە وتف لە ستەمکار
دەکا !

«زانایانی بەناوبانگی کورد»

# ئیبنـــولحاج

رەحیم فەرەج

ئیبنولحاج زانای گەورەو، ئەدیبی پایە بەرزو، شـەرع زانی کەم وێنەو، موحەدیسی بەناوبانگی کوردمەلامحەمەدی کوڕی حاجی حەسەنە، خەڵکی دێی (سنجوێ)ی سەردەشتە.

سەرەتای ژیانــی ئــەو زاناگەورەیـە نـەزانـراوە. ئەوەندە نەبێ کەلەسەرەتای ژیانی داوپاشتـەواو کردنی خوێنـدن لـەدێی سنجوێ بۆ ماوەیەک دەرسی گوتـۆتـەوە و زاناوخوێندەواری پێگـەـ یاندووە. پاش ئەوماوەیـە لەبەر هۆیەکی نەزانراو (کەم وابووە مەلایەک پاش ئـەوەی لەجێگەیەکدا بووبێ بەماموستا بێ هۆیەک ئەو جێگـەی خـۆی بەجێ هێشتبێ وبۆولاتێکی دی یابۆجێگایەکی دوورچووبێ) جێگەوشوێنی خۆی بەجێ هێشتووە وچۆتە دێی (هەزار مێرد)ی نزیکی تانجەرۆو سلێمانی و لەوێ دەستی بەدەرس گوتنەوە کردووە ولەهەموو لایـەکـەوە فەقێ بەتاسەوە بۆخزمەتی هاتوون ولەکۆڕی دەرس گوـ تنەوەدا بەو پەڕی ئەدەبەوە دانیشتوون و لـەدەریـای بێ پایانی دوڕوگـەوهـەریـان وەرگرتووەو شەوو رۆژیان لـە خۆیان هەراسان کردووە. بۆ ئەوەی کاتیان لەکیس نەچێ و زیاتر کـەلک لـەوسەرچاوە روونە وەربگرن.

وەکـوو گـوتمـان هیچ بەڵگەیەکمـان دەربـارەی، سەرەتای ژیانی (ئیبنولحاج) بەدەستەوەنیە هەروەهالەبارەی ژیانی کـەس وکاری چۆنـەتی بنەماڵە وجێگا وشوێنی. بەڵام لەنیوە شیعرێکی کتێبەکەیەوە کەدەڵێ: زانیومەبەئیرثییەتێ" روون وبێگومان ئـەوەمـان بۆدەردەکەوێ کەئەوزانایە لە بنەماڵەیەکی ئاینی کـۆن بووە وپشتاوپشتیان بەزانای بەرزوخوێنـدەواری چـاک هاتوونەتە خوارەوە وهەمیشە کەڵەپیاووشاسواری مەیدانەکا ـ نی زانست بوون وهـەمـوو گەیونە پلەی موحەدیسی. ئـەم زانستەیان پشتاوپشت وبۆیەکدی بەجێ هێشتـووە. بۆ پلەی (ئیبنولحاج) ئەوەنـدە بەسە کە ئەدیب وزانایانی وەکـوو ماموستـا مـلاعـەبدوڵلای بێتووشی وشێخ مارفی نـۆدی فەقێی ئەوبوون، لـەسەر سفرە وخوانی ئەدەبی ئەوتۆپشووی ئەو ئـەدەبە بـەرزەیـان، هەڵگرتووە کەجێ وشوێنێکی تایبەتی هەیە. بێجگەلەوە کـە بێتووشی ئەو پارچە شیعـرە بەرزەی کـە تـا ئێستـاش لەعەرەبیدا وێنەی نـەبووە وبەیەکێک لەشاکارە هـەرە بەنرخەکانی ئـەدەبی عەرەبی دادەنرێ، وەکوو نـامەیـەک بۆ ئیبنولحاجی ماموستای ناردووە.

ماموستای گەورەمان وەک چەرخ وسەردەمی خۆی بەڵکوو زیاتریش هـەربەدەرس گوتنەوە وزانای گەورەپێگەیاندنەوە خەریک بووە وئەسپی خۆی لە زۆرمەیداندا تاو داوەو، لـە

هەموو ئەومەیدانانەشدا شاسوار بووە.

یەکێک لەو مەیدانانە مەیدانی تەئلیف وکتێب دانانە لەم رووەوە (ئیبنولحاج) گەلێک کتێبی زانستی جۆراو جۆری داناوەودانراوەکانیشی بەچاکترین کتێبی بابەتی خۆیان ناسراون.

بەڵام گومان لەوەدانیە وەک مێژووی ژیانی نازانرێ زۆربەی کتێب ونوسراوەکانیشی

پیاوێک بێتووشی ئەو نامە بەرزەی بۆنا ردبێ بە نامەیەکی لەوە بەرزتر یا وەک ئەوە وەڵامی نەدابێتەوە؟ بێگومان خوێنەرانی بەرێزیش لەگەڵ ئێمە دەڵێن: نابێ. بەڵام لەمەولایش مێژووی ئەو زانایەهەروا بەنادیاری بمێنێتەوە؟ من لاموانیەئەگەر هەوڵ بۆکۆکردنەوەی، پاشماوەکانی بدرێ گەلێ شتی بەنرخ وەدەس دەکەوێ.

شیعرانەی بەوجۆرە گوتراون وئەوانەی کەلەسەر ئەو رچەو رێبازە رۆیشتوون وتاکەی ئەو شێوەدەوامی کردووە، تا ئێستا هیچی دەربارەی نەزانرا ـ وە. لێرەدا ناوی هێندێک لەبەرهەمە ناسراوەکانی پێشکەشی خوێندەوارانی بەرێز دەکەین:

١ـ نظم محاسن الغرر.

٢ـ شرح نظم محاسن الغرر

٣ـ رفع الخفاعن ذات الشفا

تا ئێستا نەناسراون ورەنگە زۆریشیان بێ سەروشوێن لە نێوچووبن.

بەهەر حاڵ ئەوەندەی پێمان بکرێ سەرنجی خوێندەوا ـ ران بۆئەم باسەرادەکێشین وئەوە دەڵێین: پیاوێک بەو هەموو زانستەو، بەوهەموو ئەدەبەوە، دەبێ شیعریشی زۆر نەبێ؟دەبێ دیوانی شیعری عەرەبی یاکوردی ـ نەبێ؟ دەبێ بۆگەلێ بابەت ومونا سبە، شیعری نەیابی نەگوتبێ؟دەبێ

سەرەڕای ئەمانە بۆرێزی ئەو زانایە هەمیشە ئەوە لەبیر ناکرێ کەیەکەم کەسە تائێستا ناسرابێ،لەئەدەبی نووسراوی کوردیدا ـ کتێبی بە لەهجە وعەروزێک داناوە کە جگەلە شیعرەکانی( ئێل بەگی جاف )و( ئەحمەدی کۆر )کتێبی پێ دانەنراوە ونەبێسراوە.

دەبێ ئەو جۆرەعەروزەلە سەردەمێکدا باو بوو بێ و شیعری پێ گوترابێ، بەڵام سەرەتای ئەو سەردەمەو، ئەو

٤ـ حاشیەی ( مەونە)ی لە سەرکتێبی(البهجة المرضیە فی شرح الالفیە).

٥ـ رسالەفی بیان المقصود والممدود.

٦ـ مەهدی نامە

**خەتمی عەلامەتان تەمام ئەو جاکۆتا بکەین کەلام ئەرجوولە ( رب ذی الانعام ) خەلاسن کالە قیامەتێ**

ئاڤێ ژهەر جی یێ چی یا دەرددا
گوولک و سێ بسکێ ژنو سەر ددا
خەلقێ تەزە پەز ودەوار بەر ددا
رێز رێز دبوون ل چی یا کەری یێ می یا
خوش دکشین سەر بەرف و بەلەکێ یا

* * *

دەما بوهارێ کو پەز دچوو چولێ
گول وەددان هەر درک و هەر قولێ
پەز دەردکەت ژ هەر نەوال و دولێ
سەری دکەت ناڤ کەری و می دزان
شەمزە دئانین بەخڤان و لاوێ جان

* * *

بەخڤان دخون زاک و فرو خەلەندور
عەردێ ل بن هەبانا خو دکن کور
کەڤرا لناڤ ئاگرا دکن سور
داوێژن ناڤ زاک خەلەندور چێدکن
کەرێ تینن شەمزەلوکا لێدکن

* * *

ئاخ شلێروک رەفێ تەیرا فر ددان
بلوورڤانا هەڤرا بلووری ددان
پنجارچنا ل بەر وان دەنگ ڤەددان
مەژی دلیست سەر سینگ و پێسیراتە
ئەڤ یەکانا گەلودێنە بیرا تە

* * *

تووری پنجار مە ددا سەر بەندکێ
ئەم دهاتن گوولک، ترشو، مەندکێ
وەک خەزالێ بچرپینە دەندکێ
ئەودەم وەکی خەونا ل بیرا منە
ناڤ پەروکا سینگ و پێسیرا منە

* * *

ئاخ شلێروک کوترێ تە دفریان
کێرووشک ل بن قیفارادا درەڤیان
چول و چیمەن شین دبوون گول ڤەددان
توخو دبووی بەهشتا روویێ عەردێ
ئەرێ وەللەه خەملا بوهارێ تەتێ

* * *

ل بوهارێ دەنگێ قولنگ و قازا
رەف رەف دچوون ناڤا قامووش و سازا
کالەکالا هوگچ و ماز، درمازا
وەک پەرژینا سینەمێم، بەرچاڤایە
دبیرا من هەرمێشە و هەر گاڤایە

* * *

دیمەن و بینبەرێ تە ناچە ژ بیر
تا مرنێ هەیلو دەماک دبم پیر
مەرڤ دەبێک بیر نەکە ئەمەک و شیر
ئەمەکی تە ئوستی یێ مەدا گەلەکە
مێر ئەوە کو ئەمەکێ دا بیر نەکە

* * *

ئاخ شلێروک کانی یێ تە خوش هلکەلین
کەچ وبووکێ چاڤ بەلەک و گولا ڤین
جەرێ ئاڤێ ل سەر ملا دئانین
دەستە دەستە دمەشین بووک و زەری
باڤێ گولا ل پێسیر و بەرسەری

* * *

ل وی گاڤێ تاڤا تە دقژلاند*
کانیێ پێ تە ژ چاڤ هێسر دڕژاند
گول چیچەکا داواتە دخەملاند
وان گولانا هندێ بۆمە بشینە
بدە ئاڤێ، ئاڤێ ژ مەرا وەرینە*

* * *

چ خۆش دهات دەنگێ تەیری حەشە*ری
قەوە قەوا خاسەکەو و کەو دەری
دەنگێ شالوولا دهات ژ هەر دەری
بولبول دنالین هەر وەک ئەڤینداری
کو بینا من دوور کەتیە ژ یارێ

* * *

سۆرگول و گولسۆسنان پەلگ وەددان
چ خۆش دهات کالەکالا بەرۆ* دان
فیتینا زاڕێن بچووک و بەرخەوان
چەندێ خۆش بوو چیا و زوزانێ تە
دەنگێ پەزو شڤان و بەخڤانێ تە

* * *

ئاخ شلێرۆک چیڤ چیڤا رەشۆلەکا
کەو کۆترا، دخاندن هەر کێلەکا
دهات دەنگێ گۆلک و وان چێلەکا
بەرخ و کارێ سۆر و سپی، رەشبەلەک
کەری، کەری دچێریان مشە* و گەلەک

* * *

ئاخ شلێرۆک سۆنە، ئۆردەک بەر چەما
قاز و قومری خۆش دنالین هەردەما
ئەوانا قەت نزانین ئا*رشا غەما
تەیرێن بازی پەڕ لی ددان دقووژیان
ئەوان پەیێ نێچیرێ خۆ دگەریان

* * *

شلێرۆکێ ئەو شلێ*رێ بەیانی
خارمێل دبن ل سەر زانگ وبەرکانی
چەندێ کەژن ، چا دهەژن ب جوانی
زۆر بنازن، دل بخازن ، سەر رازن
جێ هێلوونا تەیرێ ئەل*وە و بازن

* * *

ئاخ شلێرۆک مام سۆسنێ تە شینن
بێهنا وانا کولا دل دوەشینن
کانیێ تە وەک گوهەرێ چلڤلینن
پوونگ لناڤاوان ئاڤادا دهەژن
پەل*ەخ وەکی پۆڕی کەژالا کەژن

* * *

شلێرۆکێ کەری یێ قەرقاش دکشە
وەک لێڤی یێ بەر ب مەغەل دخوشە
نێریێ کەڤەر پێشی یاکەری دمەشە
ئەو نێری یا بۆ کەری یا پێشەنگە
کەری یێ بێ پێشەنگ وەللەهی دلەنگە

* * *

ئاخ شلێرۆک روویێ تە چیل* کەڤەربە
پێسیرا تە تژی گولێ سۆر، زەربە
پشتی مەژی دلێ تە بێ کەسەر بە
دونیا حەموو مەڕا قەزا و قەدەرە
مەرگ و مرن ل پەیێ مە دگەرە

* * *

پرسیاری ١٧- به بڕوای
ئێوه ده‌وری گۆواری سروه
به‌ناوی گۆواری ناوه‌ندێکی
ئه‌ده‌بی و فه‌رهه‌نگی له
به‌رانبه‌ر فۆلکلۆردا چیه؟

وه‌ڵام- به بڕوای من
ئه‌و ناوه‌نده ناوی خۆی
به‌خۆیه‌وه. ناوه‌ندێکی
فه‌رهه‌نگی و ئه‌ده‌بی یه و
ده‌بێ زیاتر سه‌رنج بداته
فه‌رهه‌نگ و که‌له‌پووری ئه‌و
گه‌له و زیاتری خۆ پێوه
ماندوو بکا و خه‌ڵکیش
زیاتری له خزمه‌ت دابن.
زیاتر دڵسۆزی بن. هه‌رکه‌س
له هه‌رجێ یه‌که هه‌ر شتێکی
فه‌رهه‌نگی و که‌له*پووری
وه‌ده‌ست ده‌که‌وێ کۆی بکاته‌وه
وسروه‌ش به‌ناوی ناوه‌ندێکی
ئه‌ده‌بی وفه‌رهه‌نگی تا ئه‌و
جێ یه‌ی له‌ده‌ستی دێ بۆ
پاراستنیان هه‌وڵ بدا ،کارێک
بکا ئه‌وانه‌ی له‌و ڕێبازه‌دا
کار ده‌که‌ن یه‌ک بگرن وبه
پێی به‌رنامه‌یه‌کی زۆر ورد
و جوان ورێک و پێک و
حیسێب کراو هه‌نگاوێکی به
که‌لک بۆ زیندووکردنه‌وه‌ی
که‌له‌پوور وفه‌رهه‌نگی ئه‌و
گه‌له هه‌ڵ بگرن .

پرسیاری ١٨- هه‌ر وه‌ک
ده‌زانی له‌باری فه‌رهه‌نگ و
ناساندنی به‌یت و به‌یت
بێژانی کورده‌وه سروه
یه‌که‌م گۆوار بووه له
ئێراندا که بایه‌خی به‌و
مه‌به‌سته داوه . ئایا له‌و
پێیه‌دا تا چ راده‌یه‌ک
سه‌رکه‌وتوو بووه و له‌مه‌و
دواش ئه‌رکی له‌و ڕێبازه‌دا
چیه ؟

وه‌ڵام- به‌ڵێ. به حه‌ق
سروه یه‌که‌م گۆوار له‌نێو
خۆدا بووه که ده‌ستی به‌و
کاره کردووه به‌ڵام عه‌یب
و ئیرادی کار لێره‌دایه
که ئه‌و ناوه‌نده به‌ناوی
ناوه‌ندێکی ئه‌ده‌بی وفه‌رهه‌نگی
و لانی کم هه‌ر له‌باری
فه‌رهه‌نگی یه‌وه ده‌بوو به‌ر
له‌و کاره خوێنه‌رانی خۆی
به ناساندنی ئه‌و خه‌زێنه
بایی داره وائاماده کردبا
که خوێنه‌ری تامه‌زرۆ خۆی
ڕێگه‌ی خۆی دۆزیباوه ،خه‌ڵک
سروه‌یان هان دابا و
ناچاریان کردبا زیاتر
بپرژێته سه‌رئه‌و مه‌به‌سته.
کاتێک بۆ وێنه بیۆگرافی
خوالێخوشبوو حه‌مه‌دی به‌یتان
یا کاک حه‌مه‌دی ئاغای یا
ڕه‌سووڵ مینایی له سروه‌دا
چاپ ده‌کرێ، ئاشکرایه
خزمه‌تێکی گه‌وره‌یه ،کارێکه
تا ئه‌ورۆ هیچ گۆوارێکی
کوردی نه‌یکردووه. به‌ڵام
هه‌موو که‌س به‌و خزمه‌ته
نازانێ ، زۆرکه‌س ته‌نانه‌ت
نازانن به‌یت یانی چی.
کاتێک سروه ده‌نووسێ فلان
به‌یت بێژی مه‌زن سه‌باره‌ت
به پاراستنی به‌یته‌کان چ
زه‌حمه‌تێکی کێشاوه چه‌نده
گه‌ڕاوه و چی کردووه‌و چی

نەکردووە. زۆرکەس نازانن بەیت چیە وئەو زەحمەتە تا چ رادەیەک پێویست بووە. یان کاتێک فلاّن بەیت لە سروەدا بێ هیچ لێکدانەوەیەک بێ هیچ هەڵسەنگاندن و تەنانەت مانای وشە دەرخستنێک پێشکەشی خوێنەر دەکرێ نابێ چاوەنواڕی ئەوەبین

سۆنگەی خزمەت بەفەرهەنگ کردنی سروەدا واخۆ بناسن و ئەدەب و فەرهەنگ و کەلەپووری خۆمان بناسن کە نەکەونەخزمەت کردن بە فەرهەنگی کابرایەکی چینی یان ژاپۆنی ـ ناسینی هایکۆ... ناسینی فلاّن شاعیری هەندەران .بەراستی پێویستە، کارێکی باشە بەڵام

لەباری فەرهەنگی یەوە خەڵک بگاتە ئەو مەبەستە کە لانی کەم بە ئەندازەی نوێلێک یا پەخشانێک یا شیعرێک رێزی بۆ دابنێ. هەڵبەت ئەوانیش تارادەیەکی زۆر پێویستە بن. بەلاّم نە تا ئەو رادەیە کە هەمیشە کەوەکەوەبەرئەدەب بکەوێ و چۆڵەکە وەبەر فەرهەنگ! کەبڕوام ئەوەیە ئەدەب دەتوانێ لەمەیدانی هەراوی فەرهەنگدا رمبازێن بکا.

واباشە لاوە دڵسۆزەکانمان لە لایەن سروەوە بەوشیار کردنەوەی ژیرانەی سروە لە

کەی؟ پاش ناسینی خۆمان یا بەر لەوەی بزانین ناوی خۆمان چیە! سروە دەتوانێ نەهێڵێ کە بڕوامان وابێ:

ئێمە بەداخەوە هیچمان نیە، کەسێکی وەک فلاّن شاعیری ژاپۆنیمان نیە شیعر وهۆنراوەیەکی وەک هایکۆمان نیە، بەسەرهاتێکی هاملێتمان نیە،هەشمانبێ شاراوەن.

ئەوەندەم بڕوا بەسروە هەیە وا دڵنیام لەوە کە سروە لەناو دڵی خەڵکدایە باری گرانی سەرشانی سروە واهەست دەکەم کە دڵنیام

دەتوانێ تەواوی ئەو کارانە بکا.

سروە دەتوانێ ئاوێنە ـ یەکی باڵنوێن بێ بۆ دەرخستنی هەموو بارێکی جوان ودزێو. ئاشکرایە کەس بەدزێوی خۆی رازی، نیە. ئەوکاتە هەوڵ دەدرێ بۆ دەرخستنی جوانی یەکان رەنگە بڕواتان وابێ زۆر بارو زۆر قسە بۆ کوتن نابن. رەنگە لەسەر ئەو بڕوایە بن لە کارێکی وادا زۆر مەبەست شیاوی باس کردن نین بەلاّم پێم وایە هیچ قانوون وزاکوونێکی ئینسانی نالێ تۆ باسی دەرمان مەکە، نالێ تۆ باسی فلاّن گۆرانی ئەویندا ـ رانە مەکە، یان فلاّن مەبەستی نالەباری کۆمەڵایەتی مەهێنە گۆڕێ، جا مەگەر نەزانین چۆنیان باس بکەین ونەزانین مەبەستمان لە باس کردن چیە و دەمانەوێ چ بدەین بە خوێنەر،ئەگەر مەبەست دەرمان بوو، مەبەست وشیارکردنەوە بوو باسی دەردیشت کرد کەس دژایەتی لەگەڵ ناکا. ئەگەر کوتت کاتێک لاوێکی کورد بە خۆشەویستەکەی دەڵێ: تێی هەڵدە دەگولەی مێردت بۆم وەرە ژوانێ، هۆیەکەی چیە و رەگ وریشەی ئەو دەردە لەکوێ یە، کەس تانووتت

لێ نادا .

بەڵێ خەڵک حیسێب لەسەر سروە وئەرکی سەر شانی سروە دەکاتەوە هەربۆیەش دەبێ زۆر وردتر بێ و قووڵتر بڕوانێتە ئەو مەبەستانە .

پرسیاری ١٩- بە ناوی کەسێک کە چەند ساڵە لەو بەشەدا کار دەکەن چ پێشنیارێکتان هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خەریکی کاری فەرهەنگین ؟

وەڵام- لەپێش دا خۆیان ساغ کەنەوە ، ئایا چ مەبەستێکیان لەو کارە هەیە؟ دەیانەوێ ناوی خۆیان بەسەر کتێبێکەوە ببینن یائەوە کە خزمەتێک بکەن . ئەگەر داخوازی ناوبانگن لەو کارە گەڕێن ئەگەریش دەیانەوێ خزمەت بکەن دەبێ خۆیان بۆ زەحمەتێکی زۆر ئامادە بکەن. تەنانەت لۆمە و تەشەر ! چونکە زۆر کەس بەداخەوە ئێستاش لەسەر ئەو بڕوایەن چەند ساڵ لەبەیتێک کۆڵینەوە وچوار وشەی ڕەسەن دیتنەوە لە سەدەی بیستەمدا حەیفە خۆی پێوە ماندوو بکەی

ئەوکارە پێویستی بە سەبر وحەوسەڵەی زۆر هەیە ماندووبوونێکی زۆری دەوێ، کەم لوتفی دۆستانیش لەوێ ڕاوەستێ کە ئامادە نین تەنانەت ئیزن بدەن چاوتان بەکتێبێکی وان بکەوێ و نووسراوەیەکیشی ببینن . نابێ لاتان وابێ ئەوکارە بە ساڵێک ودوان دوایی دێ وئەو دارە بەرو سەمەر دەگرێ‌بەکورتی دەبێ ئەوەندە ئەویندار بن کە خۆتان ببنە بەیتێک .پاشان هیچ گرێ وچ کەند و کڵۆیەک شلتان ناکاتەوە ئەگەر بکرێ بۆ کاری وا چەند کەس پێکەوە هەوڵ بدەن و هەرکامەی بەشێک لە کار وەئەستۆ بگرن زۆر باشترە و زووتر بە ئاکامدەگەن .

ئەوانەی لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا فێری بووم ئینشائەڵلا لە هەلێکی باشدا بەڵکە بڵاو بکرێنەوە کە دووجار بە ڕێ یەکدا نەرۆن و چەندجار کارێک نەکەنەوە .

پرسیاری ٢٠- هەڵبەت دەبوو ئەو پرسیارەمان لەپێش دا لێ کردبای بەڵام ئەگەر دەکرێ هێندێکیش لەبابەت ژیانی خۆتەوە بدوێ

وەڵام- ئەمن ناوم عەلی خزری یە ، ساڵی ١٣٣٢ی‌هەتاوی لە گەڕەکی سەربەرداش لە مەهاباد لە دایک بووم هەرلە مەهابادیش خوێندم وساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی ژنم هێناوە و هەتا ئێرە ! چوار منداڵم هەیە، ساڵی ١٣٥٢ چوومە ڕادیو مەهاباد و دەست بەکار بووم. هەتا ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی هەر لە مەهاباد بووم لە بەهاری ساڵی ١٣٦٢ ڕاچوومە باختەران ولەو کاتەشەوە لەبەشی کوردی وێ کاردەکەم زۆر سوپاسی ئێوەش دەکەم کە ئەو هەل ودەرفەتەتان دابە من کە دەگەڵ خوێنەرانی بەرێزی سروە دەردی دڵ بکەم. هیوادارم هەموو لایەک سەرکەوتووبن و گۆواری سروەش هەر وەک هەمیشە سروەیەکی بەهاری بێ، گیان بەخش وبۆژێنەرەوە.

لێرەدا جێی خۆیەتی لە لایەن دەستەی نووسەرانی سروەوە پڕ بەدڵ سپاسی کاک عەلی خزری بکەین کە لەم وت ووێژەدا بەشداری کرد ووەڵامی پرسیارەکانی بەوردی داوە.

وێڕای داوای سەرکەوتن بۆ ئەم بەڕێزە وهەموو ئەدیب وزاناو فەرهەنگدۆستانی وڵات هیوادارین تەنگ و چەڵەمەی ڕۆژگار تەنگی پێ هەڵنەچنێ وئێمەش بتوانین بەرهەمی کاری کاک عەلی خزری بخەینە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز.

"دەستەی نووسەرانی سروە"

لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ
لێ میرۆ لێ لێ میرۆ
ملێ خانێ خۆش ملێ خانێ
بەژنا بەدرخان بەگ زراڤە مینا بناتلا
بنا ریحانێ
شەمۆیێ دێرشەوی کرە گازی :
وەسمان پاشا کووچک باب
دەستێ بابێ تێلی میرێ بۆتا شێرێ کوردا
بتە نایێتە گرێدانێ
دەلۆلۆ ... لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان و لـــە
پەی مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مە دمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا

کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یـــێ
ئاغان و عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ بلندە لە دەوی رێ یۆ
وەسمان پاشا یاوورک کشاندە قووچا میسلا
ئەز دکم و ناکم قەواتا من ناشێیۆ
بلا قەواتەکە گران هێژا ژمرا بێ یۆ
تۆپی مەزن بلا ژمرا بێ یۆ
حەسەنێ هەویرێ تاهیرێ مەیمۆسامـی یـــێ
لۆتی
شەمۆیێ دێرشەوی کۆپەکێ مەزن
ئیروسەرێ حەفت سالا لەچیایێ ئەورەقی
بینە ئاسێ یۆ

ده لۆلۆلۆ..لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولە پەی
مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مە دمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
بەسەر ولاتێ شارێ جزیرێ بۆتادا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
سنجەقا عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ
لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ دا کەتم وا بلالیوۆکا
وەسمان پاشا یاوورک کشاندە قووچا میسلا
دەبلا بێت ژمەڕا تۆپێ تەم بچیکا
حەسەنێ هەویرێ تاهیرێ مەیمۆسامی یێ
لۆتی
سێ رۆژە شەر دکن لەگەلێ ئەورەقی
وەکی کەیفێ زاڤا وبیکا
دەلۆلۆلۆلۆ..لۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولەپەی مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مەدمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
میران و عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ
لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ خۆش ملێ خانێ
بەدرخان بەگ دکە گازی :
حەسەنێ هەویرێ تاهیرێ مەیمۆسامی یێ
لۆتی
شەمۆیێ دێرشەوی
هنگ شەڕی ناکەن بە ئاشق و دلا
شەمۆیێ دێرشەوی کرە گازی :
میرۆئەمێ چاوا شەڕی ناکەین بەئاشق و
دلا
ئەڤرۆ شەر بمە هەرچار خۆش مێرا
مینا کەیفێ زاوایان و خەملا بیکا

میرو ماتە نەزانی لمە هاتە کوشتن
تاهیرێ بچیوکا
دەلۆلۆلۆ...لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولە پەی
مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مەدمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
سنجەقا عەشیرەتێ
لێلێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێلێ
میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ خۆش ملێ خانێ
میر بەدرخان بە سێ دەنگا کرە گازی:
حەسەنێ هەویرێ تاهیرێ مەیمۆسامی یێ
لۆتی
شەمۆیێ دێرشەوی :
وەسمان پاشا سەکنی جزیرا بۆتا
برۆژێ عەسکەرێ خو کۆم دکە
بشەڤێ بەرەلاً دکەتە سەر رێزا گوندا
ئەڤ شەڤ من دڤێ باڤێنە سەرئۆردویێ
وی کووچک بابی ..
ببرن سەرێ تۆپچی و قۆمان دارا
دەلۆلۆلۆ...لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولە پەی
مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مە دمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
سنجەقا عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێلێ میرۆ لێ لێ میرۆ
لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ خۆش ملێ خانێ
میر بەدرخان بەسێ دەنگا کرە گازی:
حەسەنێ هەویرێ تاهیرێ مەیمۆسامی یێ
لۆتی

شەمۆییێ دێرشەوی :
وەسمان پاشا سەکنی جزیرا بۆتا
برۆژێ عەسکەرێ خو کۆم دکە
بشەڤێ بەرەلا دکەتە سەر رێزا گوندا
ئەڤ شەڤ من دڤێ باڤینە سەرئوردویێ
وی کووچک بابی ...
ببرن سەرێ تۆپچی و قومان دارا
دەلۆلۆلۆ..لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولە پەی
مەتێ
حەیفە بو مخابنا دلێ مە دمینی
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
سنجەقا عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ
لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ وا بدارە و بلالیکا
هەر ما شارێ جزیرێ بۆتا خۆش دێ دەنگێ
زاوایان وبیکا لێ لێ میرۆ
زەینەب خاتوون کرە گازی لە میسلا و
بەغدایێ
تۆپا رادەکیشنو تابان پاشا تۆپی کەلێ
رەش
ژ مەڕائینا
وەسمان پاشا کەتمە بەندێ تە دانە
گازەکی
وان پیرا و بچیوکا
دەلۆلۆلۆ...لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولەپەی
مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مە دمینی
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
ئاغان و عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ
لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ خۆش ملێ خانێ
میر بەدرخان چوو سەیرانە شەڕێ
مەیت کێشانە مینا کێشاناکایێ لجوخینا
لەشێ ئەسکەر وتۆپ وجبەخانە مانەلچۆلینا
بانگ کر سوارا شەڕی بەتال کەم هنگ
رازینا ؟
شەمۆییێ دێرشەوی کرە گازی :
میرۆدانە بادێر گولا رەنگین جی ییێ مەیە
دەستێ مەبێ شەڕ لێ وەنابە
دەلولولو...لولو
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولەپەی
مەتێ
حەیفە بۆ مخابنا دلێ مەدمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
سنجەقا عەشیرەتێ
لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ لێ لێ میرۆ
لێ لێ میرۆ لێ میرۆ
ملێ خانێ دا کەتم وابجەمەدا
زەینەب خاتوون پیش عەسکەرێ وەسمان پاشا
وەچوو
جەلەوێ هەسپێ وەسمان پاشا گرت و بەر
نەدا
وەسمان پاشا کەتمە تۆرا تە و بابێ تە
دەستێ بابێ تێلی بەگ هەتا باژێرێ
دیاربەکرێ
لە کەلەپچەمەدا
دەلۆلۆلۆ..لۆلۆ
لەمەتێ دەنگێ تۆپان وجبەخان ولەپەی
مەتێ
حەیفە بو مخابنا دلێ مەدمینێ
کووچکێ کوشتەرێ رۆمیا
کەتنە وولاتێ شارێ جزیرێ بۆتا
هەیلۆ بابۆ لەمن خراپ دکن جی یێ
میران و عەشیرەتێ

ئاوایی زوڵمئاوا یەکێکە
لە گوندەکانی ولاتەکەمان .
برێ کات ناوی شتێک سەرنجی
پیاو بۆلای خۆی رادەکێشێ.
"زوڵمئاوا" بەراستی دەڵێی
کالایەکە و بە بالای ئەم
چەند رێزە ماڵەوە بڕاوە!
دیمەنی ماڵەکانی جۆرێکەکە
دەڵێی کەسانێک بەپەلەپەل
و سەرلێ شێواوی لەو
لێژایی یە ئەو هەموو
خشت وکوچک، و کولۆیەیان لە
سەر یەکسوار کردووە و بە
ناهومێدی یەوە دارەڕایان
کردووە تا چەند رۆژێک
خۆیان لە هورووژمی بەفر و
باران و رەشەبا بپارێزن.
رەنگە ئەگەر خەڵکی تێدا
نەبوایە رێبواری ناشارەزا
ئەم پرسیارەی بۆ دەهاتە
گۆڕێ کە ئەم ماڵانە
شوێنەواری کام دەوری
مێژوون ؟

بە پێچەوانەی ماڵەکانی
ئاوایی کەدەڵێی چەپۆکێکی
توند وبێ رەحمدیوارەکانی
لاروگێرو نەپۆڕ(۱) کردووە
تەبیعەتی دەوروبەر بە
قەولی خەڵک، شاقزی(۲) نواندووە!
بەر ئاوایی کانی و
دارستانێکی چڕوپڕوشینایی-
یەکی دڵکەشی لێ هەڵکەوتووە
و کانی و حەوزی ئاوایی
هەمیشە خوڕەیان دێ .

کاکەعلی یەکێک بوو لە
خەڵکی ئەم ئاوایی یە.
پیاوێکی بەکارو لەسەرەخۆ
بوو. دوو کوڕو کەنیشکێکی
بوو. لە زەوی و زاریشدا
جێی یەک دوو تۆمەشان(۳) زەوی
بەراوو برێکیش دێمی
هەبوو.

بەهۆی لێهاتوویی و
ژیری یەوە توانیبووی
ماڵەکەی نەختێ پاکتر و
چاکتر دروست بکا .
دەروازەیەکی گەورەی رەنگ
کراو، وبالاخانەکەی ، ماڵی
ئەوی لە ماڵەکانی تر جیا
دەکردەوە. کاکەعلی لە
کشت وکاڵ وئاژەڵداریشدا
هەر لێزان و ژیر بوو. جاران
بێستان و مەزرای کاکەعلی
لە تەواوی ئاواییدا نموونە
بوو. لەپەڵە شەوەر(۴) و وێنجە
و خەیار و تەنانەت لەگەنم
و جۆیشدا هیچ بژارێک
نەدەبینرا . خەڵکوەخت و
بێ وەخت دەیاندی کەخەریکی
هەڵکەندنی بنە"هەرێزێک"(۵)
یا "چاوزاقەیەک(۶)" بوو کە
بێ ئیجازەی ئەو لە نێو
حاسڵەکەیدا پنجی کوتابوو.
کورت و کۆتا لە دەستی
زەحمەت و کاری خاوێن و
چاکو لەچاوانیشی عیشق و
عەلاقە و ئەوین دەباری. لە
وەختی کار و فرماندا
دەمە و بەیان لە ماڵ
دەردەچوون و بە تاریکان
دەگەڕانەوە و ئەستێرەیان
پێکەوە دەلکاند. بە هۆی
کارو زەحمەتی زۆر دەم و
چاوی دەتگوت لە بەردیان
تاشیوە قەت ئاو لە ژێر
پێستی نەخزابوو(۷). بەڵام بەم
حاڵەشەوە بەرهەمی کەم
بوو. بە سەخڵەت خۆی و
منداڵەکانی دەژیان .

**م. سووتانی**

منداڵەکانی لە خوێندنی بەردەوام بێ بەری بوون. بۆیە جاروبار بە هاوالانی دەگوت:

دەککاول بێ دێ! ئێستا خێرو بەرەکەت لە شارە." با لە شەوێ بەهاردا سەری بکێشینە ماڵی کاکعەلی.

شەوێکی بەهارە، بۆنی خۆشی شەوبۆی بەهار لە سەر سفرەی شێو. بەدەم نان خواردنەوە لە کار وباری رۆژی رابردوو و رۆژی داهاتوو دەدوێن.

شەمامەی کچی کاکعەلی کە تەمەنی دە ساڵ دەبێ دەڵێی هەر ئەو بەهارە لە گەل هەڵالە و برەمبرەمی بەر ئاوایی‌دا گوڵی پشکووتووە. روو دەکاتە خۆی ئیتر وەرزێریکی تەواوە و لە کاری کشت و کاڵدا وەکباوکی شارەزا، بووە. دەزانێ کەی وادەی بێستان کردنە و چۆن حاسڵ لە ئاو دەکەوێت. کەی دەبێ ئاو لەحاسڵ بگەڕێتەوە کام زەوی بۆ چ حاسڵێک بە پیتە و کەی وادەی کۆکەند وگێرە وئالفکێشانە.

بۆیە لەم حەین وبەینەدا سەری هەڵدێنی و بە شێوەی خۆی بە توندی وەک چۆن لە گا بخوڕێ ،یا چۆن وەختی جۆماڵ برا بچووکەکەی لەو بەری دەراوەکەوە بانگ دەکاتە شەمامە و دەڵێ:

ـ دوای شەر بێستانم بڕی! هەر مەینەتە، زەوی خۆشکردن و بژار و کوڵۆ وردکردن و سەرئاوو ئاو دێران، لە ئاخریچەوە بیوە بازارو بیکەباوەش شاری یەکان و خۆت دەس وشکو خالی بگەڕەوە!

خەجێی دایکی بەلاتیرێک[9]،کوڕەکەی مەجبوور بە پاشکشە دەکا و دەڵێ:

ـ حەی حەی جائێمە چۆن بێ "تۆماتێز"وخەیار بۆمان ئەکرێت.

ـ جا وەڵلا باشە بەشکەم چاومان لە دەس مەردم بێت با کیلۆ کیلۆ لە شار بیسێنین. ئەشێ هەربەش خۆمان درووس کەین!

ـ لە پایین وێنجەکەوە

| |
|---|
| **فەرهەنگۆک**<br><br>١ـ نەپۆڕ= خواروخێچ.تێک. رووخاو و نالەبار.<br><br>٢ـ شاقز= شاکار، کچی زۆرجوان.<br><br>٣ـ تۆمەشان = تۆوچێن پێوانەیەکە لە زەوی کە بە رۆژێک دەچێندرێ.<br><br>٤ـ شەوەر ،شەبدەر ،سێوەرە<br><br>٥ـ هەرێز= فریزوو<br><br>٦ـ چاوزاخە= چاو زەقە درویەکی ناو مەزراودەغڵ ودانە کە زۆر بە ئێشەو کاری پالە لەنگ دەکا.<br><br>٧ـ ئاو لە ژێر پێستی نەخزابوو= سپی و سۆڵ و قەڵەو نەبوو.<br><br>٨ـ خووس = خووسار، زوقم ئاونگ.<br><br>٩ـ لاتیر= تانووت ،تەشەر.<br><br>١٠ـ گەدە ـ زگ، سک گەدوگیپاڵ.<br><br>١١ـ گیا درون |

دەوروبەری ئاوایی بڵاو بۆتەوە. کوێستان کە تازە لەخووسی[8] زستان هاتۆتە دەر لە تاریکایی شەودا رەش و رەشتر دەنوێنێ. بێجگە لە زریوە و ورشە و پڕشەی ئەستێرەکان وتاپۆی رەش و بەهەیبەتی کوێستان، چاو چاو نابینێ. ماڵی کاک عەلی لە دەوری چرا لامپایەک،چۆکیان داداوەتە باوکی و دەڵێ:

ـ ئەرێ بابە، ئەوساڵ چی درووس دەکەین؟

ـ بەخوا بێژم چە، هەر چی درووس کەدین هەر زەحمەتەکەمان پێ ئەبڕێت.

ناسر کوڕەگەورەی کاک عەلی تەمەنی شازدە ،حەڤدە ساڵێک دەبێ و بە پچڕ پچڕ توانیویەتی تا کەلاسی پێنجەم دەرس بخوێنێ. بۆ

دوو مەشتە خاسڵ هەر بەش
خۆمان ئەکێڵین . کاک
عەلی هەر بەم قسە دوایی
بە باسەکەهێنا .

هێشتا لە خواردنی شێو
نەبوونەوە ،کە لە کولانەوە
نەفەرێک،کاک عەلی بانگ
کرد .بە کوڕەکەی گوت :

- "ئەوە حەمەی کاکمیزایە
پێی بلێ بێتە بان ." حەمەی
کامیزا دۆستی نیزیکی کاک
عەلی یە . بۆ تۆوی گەنمی
بەهارە داماوە و هاتووە
لەوی قەرز بکا ، بە دەم
دانیشتنەوە دەڵێ :

- هەستە گورج کەشەکەتم
گەنمەکەم بۆ بپێوە و بیکە
ناو تەلیس باچم شەوگار
بەهار شەوگاری میوانداری
و دانیشتن نیە .

- ئەی بەزیا ی نەکەی!
ئێژی بۆ سکلێ ئاورهاتووە .
دانیشە با چایەک بخۆین
جا ئەچین .

- چەس ؟ ئیمرۆناوچاوت
خاس نایژێ.نەکا خەجێ لێی
داوی !

- نەوەڵڵا خەجێ لێی
نەداوم .سەرم لێ شێویاگە
نازانم چی بکەم .

- ئەها ! وادیارەدیسان
داویە لەسەرت. ناکا بۆشار
بیرۆ کەی !

- ئەم با لەم بەرەو
بێت ئەشێ و نەشێ هەربچین.
خۆ ئەم کارە بۆ ئێمە هیچی
خێر تیا نەماوە . زستان
بوو قەزانێ هاتم بچم بۆ
سمێل ریشیچم نیا بانیەوە .
مانگاکانی خۆمم فرۆشت.
مانگای هولەندیم سەند
ئەویش‌سننان دایە بن
دەسی و مرداڕۆ بوو .ئیتر
منالەکانم دەمو وشک وخالی.
بەخوا تازە لێرە یەکمان
نابێ بە دوو .

- کوڕە ئەوە هات و
چوویتە شار .چەت ئەبڕێت.
ئەوندی رەش‌و رووت تێ
رژاوە هەر بەشرمن و تۆ
ناکەوێ .

- تازە فکری خۆمم
کردووە هەر پاییزم لێ‌هات
تەوەکول بە خوا زەوی وزار
و مەڕ ومالات ئەفرۆشم‌وئەچم
منیش‌وەک‌ئەوانی تر وا
چوون .

بەم جۆرە هەلقەیەکی تر
لە زنجیری ئاوایی پچڕا .
هەر هاوین تەواو بووزەوی
و زاری کاک‌عەلی بوو بە
پوول و دەستی گرت . چووە
شار و مالێکی لەوانەی بە
شەوێ هاتۆتە دارەڕا ،سەند
ماشێنەکەی ئاوایی لە
رۆژێکی پایزدا مالی کاک
عەلی هەلگرت ولە کاتێکدا
خەلکی ئاوایی فرمێسکیان
بۆ دەرشتن ، رێی شاری گرتە
بەر .

لەشار لە دوو دیوی
مالەکەیان دیوێکیان کردبە
دووکان و ئەوی تری بۆ
دانیشتن وخەوتن وئاشپەز -
خانە وتەونی (قالی) بۆ
شەمامە تەرخان کرا .

ناسر وبرا چکۆلەکەی کە
چەند مانگێ بە شوێن کاردا
گەڕان، لە " دەوری ،
حەوزەکەی " شارداەستیا ن کرد
بە کڕین وفرۆشتنی کۆپین و
لەو کارەدا بوونە پسپۆر.

ژیانیان بەتەواوی لێ
گۆڕا .خەجێی بەستەزمان
وەک‌شتێکی ون کردبێ ، بێ
ئامانج هەر لەگەڕەکوملدا
هات و چۆی بوو . ئاخر
عادەتی نەبوو بەکیلۆماست
و تەماتە بکڕێ وبۆنانێک
بچێتە سەفی نانەواخانە .
وەرزی لێ شێوابوو و
نەیدەزانی زستان کەی دێ و
بەهار کەی تەواو دەبێ .

کاک‌عەلیش‌ئاو کەوتە
ژێر پێستی وئەودەستانەی
ئاودێران وزەوی خۆش‌کردن
و کاری کشت وکالی دەکرد،
ئێستا وردەوالەی دووکان
رێک‌وپێک‌دەکا و دەم و
چاویش‌داچۆڕاوە . حەمەی
کا میزای هاوالی جاروبار
دێ بۆ مالیان وپێی دەلێ :

- عەلی نەموت‌ئاوی شار
گەدە[10] (زگ) زل ئەکا ؟

- کاکەعەلیش‌هەرچەندلە
دلەوە دەلێ : خۆزگەم بە
جاران ،بەلام رووی تێدەکاو
دەلێ :

- تیر کە لەکەوان دەرچوو
ناگەڕێتەوە "

**بەشی ٣**

# جوغرافیای شنۆ

مارف ئاغایی

شنۆ ئاسەواری زۆرە کە هێندێکیان بەم جۆرەن :

**گوندی بێمزورتێ – دنخە – گردی دێ شەمس – گردی حەسەن نووران – چەشمە گۆل – تەپکی نەرزیوێ – چواربۆت – گردی مەلاحەمەد – قەلاّ تۆک .**

**گوندی بێمزورتێ :** لە کتێبی (**تاریخ باستان**)دا ، هاتووە کە لە چوار سەدهەزار کەس خەڵکی شاری شنۆ سەد و بیست هەزار کەسیان لەو گوندە بوونە. بێمزورتێ لە ئەسڵدا (بێ دین زورتێ) یانی (مەوقووفە) بووە. بە قەراری نووسراوە و کتێبی ئاشووری لەو گوندەدا کلیسای دارو – لعولەمای مەسیحی بە ناوی **مارابراهم** بووە کە ئێستاش ئاسەوارەکەی هەر ماوە. لەو کلیسایەدا تەشەیەکی مەسیحی بەناوی مارابراهم کە گۆیا لە حەوارییەکانی حەزرەتی مەسیح بووە لەوێ نێرگەی ئاینی مەسیحی داناوە و لە زۆر جێگای دیکەوە خوێندکاری بۆ هاتووە. ئاسەواری گۆڕستانی مەسیحییان دەگەڵ کوتەڵی شێر و بەران و بزن و.... کە لەبەرد هەڵکەندراون لەو ناوچەدا بەرچاو دەکەوێ.

ئەو کلیسایە چەند گوندی دیکەشی مەوقووفە بووە کە ئەمانەن :

**– خورشت** ( بەمانای نزیک ) گوندی هەرە نزیکی مارابراهم بووە .

**– سینگان** (بەمانای بڵیند) کە لەسەر گردێک ساز کراوە .

**– سەرگیز و نەلۆس** کە لە ناوی دووقارەمانی مەسیحی بەناوی سەرگیس و باخۆس وەرگیراون .

**گوندی دنخە :**

**دنخە** لە جەنووبی ڕۆژئاوایی شاری شنۆ هەڵکەوتووە. ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (**سر– ئۆرل ئستین**) پێش شەڕی یەکەمی جیهانی چووەتە **دنخە** و لێی کۆڵیوەتەوە. لە کتێبی (راههای باستانی غرب ایران) دا نووسیویە ئەم تەپکە دوو هەزار ساڵ پێش لە دایک بوونی مەسیح بووەوقەشەیەکی مەسیحی بە ناوی **ماردنخە** پردی داری لە نێوان دوو بەشی رووباری شار هەڵبە – ستووە و هەر دوولای شاری پێک وەسڵ کردووە.

**کێلەشین :**

کێلەشین بەردێکە کە بە درێژایی مێژوو سەرنجی پسپۆڕانی ڕاکێشاوەوزۆریان بایەخ داوەتێ. کتێبی **المنجد ، تاریخ آشور، کشیشهای ریش قرمز** لە بارەی کێلەشینەوە نووسیویانە.

لەسنووری ئێران وعێراق هەڵکەوتووە و کەوشەنی دابەشینی ئاوەکانی سنوورە و **(مقیم المیاهی)** پێدەگوترێ .

لەکتێبی "کشیشهای ریش قرمز"دا هاتووە: ئەو بەردە ٩٠٠ ساڵ پێش تەختی جەمشید دامەزراوە و ناوی سێ شاری **شنۆ** و **ورمێ** و **نێرگی** لێ نووسراوە.

وەرگێڕاوەی ئەم بەردە لە کتێبەکەدا هاتووە. هەوەڵ کەس کە کێلەشینی ناسی کۆنینەناسی ئەلمانی **شۆلش** بوو. بەڵام بەداخەوە کوژراو روونووسەکەی وەدەست نەکەوت ژنراڵ روالنین دۆزەرەوەی **بێستوون** بەشێک لەوحەکەی روونووس کرد. لەساڵی ١٦٥٢ **خانیچۆف** قالبێکی لەم بەردە هەڵگرتووە کە ئەویش لەنێو چووە. لە ساڵی ١٨٥٨دا **بلاو** بەهێندێک بەڵگەوە قالبێکی جوان ساز دەکا و ئەویش لەرێگەدا دەشکێ و دوای پێکەوەلکان شێوەی پێشووی نامێنێ.

پاش ماوەیەکی دیکە آ. **هاسایس** لەت وپەتی شکاوی بەردەکە تێک دەکاتەوە و موتاڵای لەسەر دەکا.

لەساڵی ١٨٥٨ تا ساڵی١٨٩٠ کەس کاری لەسەر ناسینی ئەو

بەردە نەکردووە بەڵام ساڵی ١٨٩٠ **دیمۆرگا ن** بۆخۆی وەدوای لێکۆڵینەوەی ئەو بەردە دەکەوێ و خانێکی ناوچە دەگەڵ خۆی دەخا ولە گوندی (هێ)را دەچێتە سەرکێلەشین

نوسخەیەکی (استامپاژ) لە بەردەکە هەڵدەگرێ وبۆ پرشیل ئاشووری زانی شارەزا دەنێرێ پرشیل وەرگێڕاوەی تەواوی بەردەکە لە رۆژنامەی Pecueild.St.auaux چاپی پاریس وەدەردەخا کە ٤٢ دێرەکە ئاوا نووسراوە:

**میهرکپوسی وایشیۆنین و کوڕەکەی منوا کە هەرسێکیان پادشای وڵاتی تووشیبا بوون، خەڵاتی هاڵدیەخێوی شاری موزازیر دەکرێن .... ویلایەتی پارسوا لەرۆژئاوای دەریاچەی ورمێ ئازاد نەکرا.**

**جوغرافیای ئابووری:**

حاسڵ وداهاتی شاری شنۆ بەستە بە زەوی وزارە. ئەو بەرهەمانەی لە ناوچەدا رەعەمەل دێن بریتین لە:

**گەنم:** بەرهەمی هەرە گرینگی کشت وکاڵی شنۆ گەنمە کە ساڵانە بەشی زۆری زەوییەکانی کەشاوەرزی دادەگرێ و بەرهەمی ساڵانەی نزیک بە چوارهەزار تۆنەکە

٢٥ لەسەدی ئەو گەنمە لە شار دەخورێ یا بۆ چاندن و ئارد و... لەکار دەکرێ و ٧٥ لەسەدیشی دەفرۆشرێ بە دەوڵەت یا بۆشارومەڵبەندی دیکە بەرێ دەکرێ.

**جۆ**: بەرهەمی ساڵانەی جۆ نزیک بە دووهەزار تۆنە کە بەشێکی بۆ مەڕو ماڵات زستانان کەڵکی لێ وەردەگیرێ وهێندێکی بۆ چاندن و ئەوی دیکەش بۆ ناوچەکانی دیکە دەنێردرێ.

**توتن**: ئاووهەوای سازگار وگڵەسوور و رەڵمەڵانی ئەو شارە بوونەتە هۆی رەعەمەل هێنانی تووتنی باش. جۆرە تووتنێک لە شنۆ رەعەمەل دێ کە قوڵەساقەتە و گەڵای پانە و تووتن ناس بە جسنێکی هەرەباشی تووتنی دەناسن. بەڵام تایبەتی بەرچاوی تووتنی شار ئەوەیە کە جگەرەی (اشنو) وێژە لە تووتنی شنۆ ساز کراوە.

**نۆک**: بەرهەمی ساڵانەی نۆک ٥٠٠ تۆنە. دە لەسەدی، ئەو بەرهەمە رادەگیرێ و پاش ماوەکەی بۆناوچەکانی دیکە بەرێ دەکرێ.

**چەوەندەر**: بەرهەمی ساڵانەی چەوەندەر نزیک بە ٤٥٠٠ تۆنە کە دەنێردرێتە کارخانەی قەندی پیرانشار. بەرهەمە ـ کانی دیکەی کشت وکاڵی شنۆ، **برینجی گردە گوڵەبەرۆژە گەنمەشامی باقلە وسێوک و پیوازە.**

ژمارەی قوتابی بەپێی ژمێرەی ساڵی ٦٥ ـ ٦٦:

ژمارەی هەموو قوتابی سەرەتایی لەشارودێ ٤٢٥٩، کەس. ژمارەی قوتابی سەرەتایی شار ٢٠٧٥ کەس. ژمارەی قوتابی سەرەتایی گوند ٢١٨٤ کەس.

ژمارەی قوتابی راهنمایی شار و دێ ٨٤٤ کەس

ژمارەی قوتابی راهنمایی شار ٧٧٢ کەس.

ژمارەی قوتابی راهنمایی گوند ٧٢ کەس.

ژمارەی قوتابی ناوەندی ٤٦٩ کەس

ژمارەی قوتابی شار و گوند بەتێکڕایی ٥٥٧٢ کەس

فێرگەی سەرەتایی کوڕانە ٦ دەست

فێرگەی سەرەتایی کچانە ٢ دەست

فێرگەی راهنمایی کوڕانە ٢ دەست

فێرگەی راهنمایی کچانە ١ دەست

فێرگەی دەبیرستانی کوڕانە ٢ دەست

فێرگەی دەبیرستانی کچانە ١ دەست

فێرگەی راهنمایی گوند ١ دەست

بەپێی ژمێرەی ساڵی ١٣٦٠ ٩٤/٣ لەسەدی کوڕان خەریکی خوێندن بوون (ئەوانەی تەمەنیان بۆ خوێندن دەبێ) هەروەها ٥٧/٤ لە سەدی کچانیش خەریکی خوێندن بوون بەڵام لە دەورەی راهنماییدا ٧٠ لە سەدی کوڕان دەرسیان خوێندووە و٤٠٫١٤ لە سەدی کچان درێژەیان بەخوێندن داوە.

لەم ژمارانە ئەوەدەردەکەوێ کە رادەی کەمبوونەوەی خوێندن دوو هۆی بنەڕەتی بووە:

**یەکەم: دایک وباب بە شێوەی شیاو بایەخی خوێندنیان نەزانیوە.**

**دووهەم: هێندێک لایان شوورەیی یە کچەکەیان بنێرنە فێرگە.**

**دریژەی هەیە**

# ف : وەفایی

پێویستی یەکانی منداڵ بۆ گەورەبوون وگەشە کردن، دووجورە .

الف ـ پێویستی یەکانی فیزیۆ ـ لۆژی

ب ـ پێویستی یەکانی ڕەوانی

لێرەدا ئیشارەیەکی کورت دەکەین بەو پێویستی یە ڕەوانی یەی کە بۆمندال پێویستن تابتوانێ بەکەڵک وەرگرتن لەوان بناخەی کەسایەتی خۆی پێدا مەزرێنێ ولەشارێی ژیانداسەربەرز وسەرکەوتووبێ .

١ـ خۆشەویستی دوولایەنە

منداڵ پێی خۆشەلەلایەکەوە دایک وباوکی ، مامۆستاکانی قوتابخانە ،هاورێ وخزم و کەس ئەویان خۆش بوێ بەتایبەت ئەوانەی لەو گەورەترن یالەو زۆر نزیکن وزۆربەی کاتی خۆی لەگەڵ ئەوان دەباتەسەر . لەلایەکی دیکەشەوە پێی خۆشە کە ئەوانی خۆش بوێ پێویستی بەکەسانێک هەیەکەئەو خۆشەویستی یەی ئەو بناسن و وەری بگرن پەسندی بکەن.

٢ـ باوەڕ بەخۆ

خاترجەمی پێویستی یەکی

بنەڕەتی یە ، منداڵ ئەگەر خەیالی ئاسودە نەبێ ناتوانێ بۆ ئامانجەدیاریکراوەکانی هەوڵ بدا ، لەگەڵ خەڵک تێکەڵ ببێ، بێ گومان بۆدەست هێنانی پێویستی یەکانی ژیان تووشی ناڕەحەتی دەبێ .

٣ـ پەیوندەی بەدەستەیەک .

منداڵ دەبێ خۆی بەستراوە بەکۆمەڵێک بزانێ کە لەوکۆمەڵەمافی دەربڕینی بیروڕای خۆی هەبێ،ئەندامی دەستەیەک بوون هەستی کەسایەتی دەدابەمنداڵ . باشتروایە ئەودەستەیەپێک هاتوو لەمنداڵەهاوتەمەنەکا ـ نی خۆی بێ کە بۆگەیشتن بە ئامانجێکی بەرز وەک ئامانجێکی وەرزشی یازانستی هەوڵ دەدەن .

٤ـ وەرگێران .

منداڵ هەرچۆنێک بێ ، هەرتوانایەکی هەبێ پێی خۆشە ئەوەندەلەلایەن دایک وباوک ومامۆستاوهاورێ و ... و وەرگیرێ. منداڵ پێی خۆش نیە لەلای خەڵک ولە کاتی پیاهەڵدانداشاخ وباڵی بۆ

دروست بدرێ . بەڵکومنداڵ دنیا بەراستی دەبینێ و پێی خۆشەهەمووشتێکی بەراستی ببینێ وبگوترێ وبەڕێوەبچێ و ...... وەرگێرانی منداڵ لە لایەن دایک وباوک وماموستا و ...... هەستی باوەڕ بەخۆی دەداتێ وئەوکات چاوەڕوانی کاری شازی لێ دەکرێ .

٥ـ سەرکەوتن .

پێش کەوتنی منداڵ پلە پلەیە . وپێویستەکەئەو پلانە بەریز یەک لەدوای یەکتر هەڵبوێرێ و بەرەوپێش هەنگاوبنێ سەرکەوتن بەسەرنالەبارییەکانی، ژیاندا ودەرخستنی وباس کردنی ئەوسەرکەوتنە باوەڕی منداڵ بۆهەڵێنانی چڵەمەوزاڵ بوون بەسەر نالەباری یەکانداپتەوتردەکا

پێویستە کەدایک وباوک و ماموستاو ... ئەوسەرکەوتنانەی منداڵ بەرچاوبخەن ورێزیان لێ بگرن .

٦ـ سەربەخۆیی وئازادی

بەستنەوە ومەکەومە رۆ کردن لەمنداڵ توانایی داهێنەری ئەولەنێودەبا . منداڵ بەئازادی وسەربەخۆیی سەرەڕونابێ ونافەرمانی فێرنابێ . بەڵکوو ئەوکارە خراپانە هۆی دیکەیان هەیە منداڵ بۆدۆزینەوە داهێنان پێویستی بەوەهەیە کەدایک وباوک وراهێنەردەردەسەری بۆمنداڵ پەیدانەکەن . ولە بەڕێوەبردنی کاردامەترسی نەخەنە دڵیەوە .

٧ـ ڕێزگرتن لەخۆ .

منداڵ دەبێ ڕێزی خۆی بگرێ وجێ وشوێنی خۆی بزانێ هەست بەکەسایەتی بکا و خۆی خۆش بوێ تیروتوانج دان لەمنداڵ کارێکی باش نیە وکەسایەتی ئەوی پێ دەڕووخێ . ڕێزگرتن لەخۆتەنیا

لەلایەن دایک وباوک وماموستا ـ وەبەمنداڵ دەدرێ و ئەوەش بەبەرپرس زانینی منداڵ لە ئەنجام دانی کارەکانیدا دروست دەکرێ .

٨ـ هەڵ نان وهان دان .

منداڵ بۆئەنجام دانی زۆربەی کارەکان پێویستی بەهەڵ نان وهاندانی دەوروبەرەکانی ـیەتی .

منداڵ پێی خۆشە کارێک ئەنجام بدا کەدەوروبەرەکانی پێیان خۆش بێ .

٩ـ هێمنی .

ڕەنگە گەورەترین پێویستی ڕەوانی منداڵ هەست کردن بە بوونی هێمنی لەکۆمەڵدا بێ مەترسی لەبەزین وهەرووژمی ناکۆکی یەکانی ژیان دەتوانن لەژیانی منداڵدا بەشێوەیەکی خراپ دەوریان بێ، ئەرکی دایک وباوک و ڕاهێنەرەکانی منداڵ لەپێش هەموو شتێک دروست کردنی بارودۆخێکی هێمنە . کە منداڵ بتوانێ لەوپەڕی هێمنەتیدا بۆپێش کەوتن هەوڵ بدا .

# ژیاننامەی شاعیری شەهید

سەرەتای بەهاری ساڵی "۱۳۴۲"ی هەتاوی ،لەحاڵێکدا کە چیا وبەندەن وپێدەشتە جوانەکانی محاڵی ئاختاچی لە ژێر هەتاوی بووژێنەری خاکەلێوەدا دەترووسکانەوەونەرمە گیای بەهاری خەملاندبوونی ، ئەودەم کە سەرما وسەختەتی زستانێ بەرەو نەمان ئاژوا بوو و ڕێژنە و ڕەهێڵەی بە گرمە وهەڕەشە پاشماوەکانی حاشار دراوی بەفری ساڵی پێشوویان سەرکوت دەکرد ، لە گوندی گوێگجەلی لە ناخی خانوویەکی لادێییدا کۆرپەیەک پێ دەنێتە مەیدانی ژیان گوێزەبانەی بۆ دەدرێ وناوی "**بیلال**"ی پێ دەڕازێتەوە . لە دایک بوونی "بیلال" هیوا و هومێد دەخاتە دڵی پیر ولاوی بنەماڵەی "زاهیدی" و لە بێشکەدا سینگی دەسرازە دەناسێ و گوێی بە لایەی کوردی دەکرێتەوە و چاوی بە دیتنی کووژەکە روون دەبێتەوە، ئەو کوڕە خوێن شیرینە لە تەمەنی دوو ساڵیدا کە لە سەربانی ماڵێ خەوی لێ دەکەوێ و تیشکی بەتاووتینی خۆرەتاوی وێ دەکەوێ ، چاوی دێشێ و تل دەخوا ولەبانی دوونهۆمرا دەکەوێتە خوار وبێ هۆش دەبێ . باپیری کە زۆری خۆش ویستووە بۆنەجات دانی گیانی نەوە خۆشەویستەکەی بە سواری تەراکتۆر بەرەو میاندواو دەکەوێتە رێ، بەڵام لەنیوەی رێگادا دەبینێ کە پشووی لێ بڕاوە وچاوی بە مۆلەق* وەستاوە ،دەستی لێ دەشوا و بەناچار بەرەوئاوایی دەگەڕێتەوە وخۆی بۆبەڕێوە بردنی کفن ودفنی نەوەکەی ئامادە دەکا کە لە پڕ هاوار دەکەن :

ئەوە زیندووە ، زیندوو !

خێرا دوکتۆر لەشار یڕا دێننە سەرینی،دوای حەوتوویەک بێ هۆشی لەجێ هەستاوەو باپیری شوکری خودای بەجێ هێنا وناوی نا "خواداو" .

شەهید بیلال بەهۆی هۆش و زەینێکی کەبوویەتی توانیویە لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بچێتە فێرگەی ئاوایی و دەس بەخوێندن بکا ، تا پۆلی سێی سەرەتایی لەفێرگەی ئاوایی خوێندووە ولە پاش وی لەگەڵ بنەماڵەکەی بەرەو مەهاباد کۆچ دەکەن وئەوجار لە فێرگەکانی مەهاباد درێژەی بە خوێندنەکەی دا .

توانایی ئەو لە نووسینی ئینشادا ئەوەندە زۆر بوو کە بوو بە هۆی سەرسوڕماوی ماموستاکانی وهان دانی ئەوان، لە دوای خوێندنی سەرەتایی پێی ناخوێندنی ڕاهنمایی کە ئەوکات گڕوگاڵی نووسینی شیعری فارسی دەس پێکرد ورۆژ بەرۆژ زەوقی شیعری پتر دەپشکووت ، کە

خوێندنی ڕاهنمایی تەواو کرد وگەیشتە ساڵەکانی دەبیرستان فێربوونی زمانی کوردی بە خوێندنەوەی کتێب ونووسراوەی کوردی هەرچەند ئەو کات نووسراوەو کتێبی کوردی نایابیش بوو دەس پێ کرد. نووسینی شیعر ،پەخشان،چیرۆک بوو بە سەرەتای کاری ئەدەبی بیلال کەبە کوردی دەینووسی. شەهید بیلال ئەوەندە ئۆگری خوێندنەوەی کتێب بوو کە هەمیشە کتێبی لەبەر دەست و چاو بوو، شەهید بیلال قسە خۆش و بە حەوسەلەوشیرین زمان وئەخلاقێکی باشی هەبوو. ڕێزی بۆ هەموو کەس لەزاڕۆک وپیر دادەنا ، بەوەرازی نەبوو دڵی کەس بشکێنێ یادڵی کەسی لێ بێ. شەهید بیلال کۆمەڵە شیعرێکی جوانی بە فارسیو

گەمی خەمی نامرادیم لە دەریای تەما
بە تۆفانی جەوری زەمان تۆزیشی نەما

منی کلۆڵ چاوەڕێ بووم سروەی دەنگت بێ
کاروانی وشەکانی پڕ ئاهەنگت بێ

چاوەڕێ بووم بژیتەوە ڕەوانی مردووم
دەرمانم بێ هەر ئەودەردەی کەوای لێ‌کردووم

چاوەڕێ بووم لە ئاسمانی شاری غەریبا
بمدیبایە ئەو ئەستێرەی کەکەس نەی دیبا

چاوەڕێ بووم بە ئاهەنگی سروەی بلاوێن
شا ڕووباری گەنجی شیعرم بڕژێتە داوێن

چاوەڕێ بووم دیسانەکەش پەندی زێڕینت
ئەو پەندانەی پەروەردەبوون بەخوێنی ژینت

وەکوو سکڵی ڕێگای‌دووری غەریبایەتی
گەرمی بدەن بە زستانی ڕێی کوردایەتی

بەڵام سەد داخ نەگەیشتمێ کە خۆزگەکانم
بێنە بەرهەم بۆ سارێژی برینی گیانم

مامۆستاگیان ئاسمانی گەش‌شەو دای پۆشیوە
بەهاری سەوز بەرگی ڕەشی عەزای پۆشیوە

لە تابووتی ناکامیدا خۆزگەکانی من
چە واشەن و تازە ئیدی کوا ڕزگار دەبن

نائومێدم لە قەهری شەو لەمەرگی ئاشتی
لەو شەوە وا مەلی خۆری خنکاند و ناشتی

مامۆستاگیان شا ئەستێرەی کەهکەشانی شیعر
ئەی ئەو کەسەی نامومکینت‌دا نیشانی شیعر

ئەی شین گێڕی مەرگی شینی وسەوزی بەهاری
ئەی ڕێبواری نەحەساوەی ڕێگای ڕزگاری

مەشخەڵداری شەوەزەنگی فەرهەنگی کوردان
ئەی ستێری ڕاخوشیوی ئاسمانی ژیان

تۆ نەقیمی ئەنگوستیلەی جوانی سروشتی
دەستی " هۆمێر" چاوی شیعری بەکلی ڕشتی

بەوێرانی بانەی وێران، دڵت بریانە
نەک هەر بانە بە مردنت‌وڵات‌وێرانە

بەڵێ گڵای* تیری ئەجەل مەودای پێ نەدای
من دەزانم ئێستاش تینووی هەزاران بریای

من دەزانم دڵی ماندووی خۆشی نەدیوت
هەر لێ دەدا بۆ ناکامی گەلی هەتیوت

من دەزانم ئێستە کەوا لەبەر چاو نەمای
وەک ئەستێرە لە ئاسمانی دڵی خەڵک‌دای

ئەی ڕێبواری پیری ئەدەب هەتا هەتایە
هەتا شیعر لە سەر "خوانی" سووری دنیایە

ناوت‌چرای کوێرە ڕێگای هونەرمەندانە
بەڵێ ناوت بەرزتر لە دەرکی زەمانە

---

کاتێک وشەی جوان ولەباری کوردی ناسی، ئەوجار هەست و بیری تامەزرۆی شیعروئەدەبی بە ووشەی کوردی خەملی ، ئینسانێکی خوێن شیرین ورەزا سووک ، دلاوا و میوانگر بوو ، کەهەرکەس لەگەلێ ئاشنا با قەت لە لای وەڕەس نەدەبوو ، کوردی لەگەڵ چەند چیرۆک و پەخشانی فارسی وکوردی بۆ بەجێ هێشتووین کە خوا پشتیوان بێ لەداهاتوودا

شەهید بیلال لە تەمەنی ٢٢ساڵیدا ژیانی رەبەنی کۆتایی پێ هێنا وهاوسەری ژینی هەڵبژارد وزەماوەندی کرد. سێ مانگ دوای ژن هێنان خۆی بۆخزمەتی سەربازی ناساند دوای دەورەی فێرکردنی شەڕ لە یەکێک لە پادگانەکانی (م.ت) بەرە و بەرەکانی شەڕ لەبەرەی جەنووب چوو، کاتێک دوایی ماموستای بەڕێز "هێمن" بەرەو روو بوو کە دیارە وەکوو هەموو لاوێکی ئەدیب و ئەدەب دۆست و شاعیر ماموستا "هێمنی" بە نووری چاو و ماموستای خۆی دەزانی، کە بەڕاستی زۆری پێ تێک چوو، هەر بەوبۆنەوە هەستی ناسکی بریندار بووو شیعرێک لە دڵیەوە سەرچاوەی گرت وشینێکی

**"کۆچم رەنگی گۆنای تۆیە"**

خۆشەویستم
روو لە سەفەر
ئەورۆ دەڕۆم
هەرچەند بەدڵ ئەسیری داوی ئەشقی تۆم
روو لە سەفەر ئەورۆ دەڕۆم بەجێت دێڵم
رێگام دوورە
رەشە، تاریکە بێ نوورە
بەڵام گیانە
من بە هەوای هەڵفڕینی
ئەو باڵندە شکۆدارەی ئەوینی تۆ
وەها وێڵم
هەرچەند دەڕۆم و جێت دێڵم
کۆچم رەنگی گۆنای تۆیە
لە بیابانی مەترسیدا
خوێنا وەکەی دەروونی خۆم دەخۆمەوە
تۆزی رێگاش بە ئەسرینی
یادی تۆوە دەشۆمەوە
بەو هیوایە لە گوڵزاری گەیشتنا
شەڕابی چاوەکانی تۆ
تێر ئاوم کەن
ئاوی ژیانێکی سەر لەنوێ
لە خاولاوی هەناوم کەن

بە چاپی دەگەیەنین و دەیانخەینە بەرچاوی خوێنەران وهۆگرانی شیعر وئەدەب.

کە بۆ دووهەمین جار هاتەوە مەرەخەسی لەگەڵ رووداوی خەمبار و دڵتەزێنی کۆچی بۆ گێڕا بەڵام بەداخەوە نەیتوانی لە کۆڕی گەورەی ماموستا "هێمن"دا بەشدار بێ وبەنۆبەی خۆی شینەکەی گێڕابا.

پاش ٥٠ رۆژ مانەوە لە بەرەی شەڕ لە کاتێکدا کە بەرگەی "مرخصی" بۆنووسرابوو و دڵی گەرمی خورپەی دیتنی عەزیزانی تێدا بوو لەناکا ـ وێکدا فڕۆکەکانی دوژمنی بەعسی فاشیست هێرشیان دێننە سەر وبۆردمانیان دەکەن، کە بەداخەوە تەڵاشی بۆمبای بەعسی ئەو دڵە گەرمە پڕ لە شۆڕ وهەست وبەزەیی و خۆشەویستی یەی بۆهەتاهەتایە لەکار خست، ئەو دڵەش وەک هەزاران دڵی گەرمی دی پێشکەش بەو خاک وئاوە کرا و بوو بە قوربانی گەل، بەداخەوە ئەو تەنانەت یەکەم ساڵ هاتی جێژنی زەماوەندی خۆی نەدی تا بەو بۆنەوە جێژنێکی بچکۆڵە بگرێ.

شەهید بیلال سەرەڕای ئەوە کە تەمەنی پتر لە ٢٣ ساڵ نەبوو بەڵام گەیبۆ پلەی ئینسانێکی باش و ئینسانێکی شاعیر کە تەنیا یادگاری ئەو شەهیدە چەند دەفتەر شیعر ونووسراوەن کە بۆ ئەدەبیاتی کورد و بنەماڵەکەی جێ ماوە، رووحی شاد ویادی بەخێر بێ.

# بۆ لۆرکا..

گۆرانی گەلی دۆم

وەرگیر

**ج. شیخەلیسلامی**

کەمانێکم خەلأت کەن
کەمانێکی دۆمانە
تا بە هەناسەی لەرزۆک دنیایە بلەرزێنم .
ئاگرێک هەڵگیرسێنن و بە دەورەی دا هەڵسوورێن ،
با ئەستێرەکان بشکێن
بۆ سەر زەوی هەڵوەرێن .
کەمانێکی بریندار وەک سینگی خۆم خەلأت کەن
تاوەکوو قسەی دلم هەلڕێژمە سەر تەڵ گەلی* .
کەمانێکم خەلأت کەن بنالێنێت و بدوێ
تاوەکوو خەڵکی دنیا نالەمیان بگا بە گوێ .
با کەمانی دۆمانەم بە هەر پەردە بنالێ
تا بیرەوەرگەلی کۆن وەخەبەر بێ و بێتە سەرزار ،
لێی گەڕێن با کەمانم دەردی دلّی خۆی بکا و
چیرۆکی غەمبارانەی ڕۆلە دومێک دەربڕێ .

*  *  *

گیتارێکم خەلأت کەن ، نالە وئۆف بخولقێنێ
تاکوو گۆرانی یەکانی دۆمانەم ببزرکێنێ* :
چاوەکانی دۆمانەی هەتاکوو بلێی ڕەش بوو ،
گیتارەکەم ، دەی بێژە !
تەختی نێوچاوانی ئەو دەشتیبەرین و گەش بوو ،
گیتارەکەم دەی بێژە !
ئەو کاتەی لە دایک بوو
منالێکی بێ خەم بوو ، وەکوو گشت منالی دێ ،
بۆ یەکەم جار لای لایەی خەمباری دایکی خۆی بیست ،
گیتارەکەم دەی بێژە !
زانی کە بۆ خەمخۆری هاتۆتە سەر دنیایە ،
گیتارەکەم دەی بێژە !

رەنگە دەنگێکی بەسۆز لە دڵی کەمانی دۆمرا
" لۆرکای کردبێتە شاعیر لە کازیوەی بەیاندا !
کام پەژارە قورسترلە خەم و دەردی دۆمە ؟!
کاتێ ئاهەنگی دۆم و
گۆرانی لەرزۆکی ئەو
لەسەر کەمان دەناڵێ
دەڵێی ئاسمان و زەوی وەک مێژۆکە* دەلەرزن ،
زایەڵە* و نارە*کانیش
بەرەوبەهاران دەفڕن .

* * *

کەم تەمەن بووم ئەو کاتەی وشەی فاشیستم کەبیست ،
بێ وەی مانای بزانم .
ساڵی ۴۱ هێشتا لەپشت گەلێک ساڵان بوو ،دەهۆڵەکەی ئەهریمەن
ئەهریمەنی خاچ شکاو ـ
نەی زڕ*یبوو لە چاوان خەوی ئارام و هێمن ،
ساڵانی خوێن ومەرگیش هێشتا گەلێک دوورتر بوو .
باوکم رۆژنامەکانی بە قەڵسی هەڵدەداوە ،
منیش لە چاوانی دا ئەمانەم دەخوێندەوە :
فاشیزم ، ئیسپانیا ، گرانادا ...
رۆژێکی دی هاتەوە ، مات و پەرۆش و گرژ :
" ئەوان شاعیریکیان کوشت ..."
دەموچاوی تێک چرژا :
" ئەی هاوار فاشیستەکان "لۆرکا یان کوشت ..لۆرکا "
" نەعلەتیان لێ بێ ، ئەوان خوێنی شاعیرێکیان رشت! ..."
چەشنی گەڵای دارێک من
لەرزیم و لەرامەوە .
چونکە دەمگوت : " شاعیرگەل بێ مەرگن وهەرمانن! "
پێ مەکەنن بەم وتەم
من هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ شاعیر ئاشنام
پێم وابوو ،بروام وابوو کە : شاعیر بەهارانە ،
هەیڤ* ، ئەستێرە ، خۆر ، ئاسمانە ،
رووبارگەلی خوڕینە ،
چاوانی ئاگرینی کازیوەکەی بەیانە .
شاعیران لقی چرۆ ،
دەنگ و هەوای گۆرانین .
" فاشیستەکان "لۆرکا "یان کوشت ..." لۆرکا " "
لەم رستەدا بوو کە من مانای فاشیزم زانی :

هەیڤ و بەیان و خۆرکوژ
خوێن مژانی چرۆ و گوڵ ...

* * +*

بەهارێکم خەڵات کەن بتکێتە ناخی زستان
هەتاوێک بە شەو هەڵبێ .
شاعیرێک ، چەشنی کراس
پێستی لە لەش داماڵن .
شاعیرێک کە ژیانی
زیندانێکی ئەوتۆ بێ ، بەبێ شەوو بەیانی
شاعیرێک قسەی وەکوو "شاندۆرپتۆفی" وابێ و
وەک "جەلیل" خاوەن هونەر
لەگوین "سابیر" دەردەدار ، وینەی "نازم" دەربەدەر ،
شاربەدەر وەک "لێرمانتۆف " ،سەربازێک وەک "شۆچینکۆ" .
گیتارم خەڵات بکەن ، کەمانێکم پێ بدەن .
جا تەل گەلی دۆمانەی ئەم دڵەم بلەرزێنن .
"من رۆلەیەکی دۆمم"
پشتاو پشت بیابانیم .
لەو رۆژەوە کە دنیام بەو چاوانەی خۆم دیوە
" ئیسپانیام بە زێد و نیشتمانم ناسیوە ."
نا ، ئاگرێکم دەنێ،بە لرفەی بلێسەی گەش
تاکوو لەودا بسووتێم وەک "جۆردانۆبرۆنۆ !"
" لۆرکا " ، " لۆرکا " ، ئاگر
ئەمەیە بەشی شاعیر ،
کە بەرزترین راستی هەر لەمەدا بەدی کرد .
خونکارەکان ، بۆخۆیان
بە ورینگەی شاعیر لەخەو رادەپەڕن وهەڵدەستن ،
بەڵام لە ئەو تۆقیون !
زیندانان دروست دەکەن
خەرمانی گڕ هەڵدەکەن
دڵانی پڕلە خورپەی گۆرانی دەوەستێنن
کورتەی قسە کەمانێکم خەڵات کەن
جا تەل گەلی دۆمانەی ئەم دڵەمبلەرزێنن

# ئێمە و خوێنەر

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وا بێ بۆ خوێندنەوەی تووشی گیروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە دەست بگاتەوە

٤- ئەگەر بابەتی وەرگەڕاومان بۆ دەنێرن ئەسڵەکەشی بۆ بەراورد و هەڵسەنگاندن بۆ ئەم ناوەندە بنێرن .

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەڕەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاواڵە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی-ئەدەبی دەتوانێ لەباری رێنووس ورێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەبابەکانی-دا هەڵدەگیرێ و نادرێتەوە بەخاوەنی تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرای سروە

**یەزد :** مەهدی سولەیمان

چەند نموونە لە شیعرەکانت بنێرە با دەستەی نووسەرانی سروە رای لەسەر بدا ئەگەر بۆ چاپ ببێ چاپ دەکرێن .

**مەریوان :** ئەحمەد قادری

نامە جوانەکەتمان پێگەیشت . پڕە لەسۆزوهەستی دڵسۆزی و عەلاقە هانی داوی و تۆش پێت خۆشە سروە بێ عەیب بێ .

براگیان ، ئەوە هەر زمانی کوردی نیە کە وشەی لە زمانەکانی دیکە وەرگرتووە . جا ئەو وشانەش دەستەی نووسەرانی سروە (بە قەولی ئێوە )نەیدزیون بەڵکوو خەڵک لەکاریان دەکا جا هێندێک کورت کراونەوە و دەستەیەک وەک خۆیان ماونەوە و دەستەیەکیش مانایان لەدەستداوە وەک وشەی " ئیختیار " لە فارسی دا مانایەکی دیکەی هەیە کە لە کوردی دا بە پیر وپەک کەوتە دەڵێن . یا خانەوادە لەکوردیدا بە مانای نەجیب بەکار دێ.

جا بۆیە هیچ پێکەنینمان نایەوهیواداریین تۆش هەروا دڵسۆزانە یارمەتی سروە بدەی.

**بانە :** ئاوارە

ئێمەش وەک تۆدەڵێین ژن نیوەئینسان نیە وبیرو باوەڕی ئیسلامیش وا نالێ. ئەگەر مەبەستت میراتە ئەوە هۆی ئابووری وکۆمەڵایەتی هەیە ووەختی خۆی باسی لێ دەکەین .

**بۆکان :** سوهەیلا هونەرپەژوو

لەوە کە سروە جێگەی رەزامەندی ئێوەیە بۆئێمە جێی شانازی یە ولەهەستی پاک وخاوێنت سپاس دەکەین داواکەتمان دا بەدەستەی نووسەرانی سروە و خوا

یار بۆ لە ژمارەکانی داهاتوودا ژیاننامەی مامۆ ـ ستا هەژار بڵاو دەکەینەوە

**شنۆ: پەریزاد عەبدوڵڵا**

سپاسی دیاری یە جوانەکانت دەکەین وهیوادارین وەک هاوکارێکی دڵسۆزی سروە یارمەتیمان بدەی .

........:عابید رەشیدی

نرخی جڵدکراوەی دوو ، ساڵەی سروە ۲۸۰ تمەنە و دەتوانی لە نوێنەری سروە لە شارەکان وەری بگری یا پارەکەی بە حیسێبی ژمارە ۵۴۰۰ ی ئینتشاراتلەبانکی سپەدا بنێری تاجڵدکراوەی دووساڵەی سروەت بۆ بەرێ بکەین .

**قزڵ گومبەد:** خدر فەللاح

سپاسی هەستی بەتینت دەکەین. نووسیوتە تاسەعات دەی شەو لە تاران کار دەکەم و دوایە دێمەوە سروە دەخوێنمەوە.من ماندوو و شەکەتم سرووش وەک مەجلیسێکی گەرم و خۆشە و دڵم نایە بەجێی بێڵم...

داوات لێ دەکەین بەو قەڵەمە جوانەت یاریدەی سروە بدە .

بۆکان : **جەعفەرڕووحی زادە**

نامە جوانەکەت گەیشت . شیعرەکانت لە ڕێنوێنی ئەدەبیدا وەڵام دەدرێتەوە.

وێنەی داشبەندت کە بۆ ناردووین هەروا ماوە و هێندێک لەباری فەننی وێنەگەری یەوە کەموکووڕی هەیە. و بۆ پشت بەرگ نابێ. بەهیوای خوا وەختی خۆی کەلکی لێ وەردەگرین .

نەغەدە: **سمایل شەریفی**

وێڕای جوانترین سڵاو سپاسی هەستی بەتین و، خاوێنت دەکەین سەبارەت بە گۆواری سروە.

براگیان،ئەگەر نووسراوە ـ یەک لەژمارەیەکی سروەدا نەبوو نیشانەی بەسەکار نەهاتنی نیە بەڵکوو نۆرەی نەگەیوەتێ.

دیاری یە جوانەکانت لە بەشی "دیاری"دا چاپ دەکەین و هیوادارین هەروا دڵسۆزانە بەهاوکاری لەگەڵ گۆواری دڵخوازی خۆت درێژە بدەی ولەم دیاری یە جوانانەمان بۆ بەرێ ، بکەی .

**سەقز:** زاهید کازمی

بەشی هەوەڵی وتارەکەت جوان بوو. تکایە بەشی دووەمیش بنێرە با پێکەوە بەراورد بکرێن وپاش رای دەستەی نووسەران بۆ چاپ ئامادە بکرێن .

ئەم وتارانەی باسیشت کردوون بۆمان بنێرە دەیخەـ ینە بەر دەستی دەستەی نووسەران تا رای لەسەر بدەن و بڵاو بکرێنەوە.

نامەو دیاری ئەم ئازیزانەشمان پێگەیشتووە سپاسیان دەکەین وهیوادارین وەک هاوکارێکی باش پێوەندی خۆیان هەڵنەبڕن.

کەرەج :**خوشکەفەریبا مەقسوودی**

کرماشان : **موزەففەر جەلیلیان**

ورمێ : **رەشید گولابی ئازەر**

بۆکان: **مونیرە فەیزە**

یۆگۆسلاوی: **ئەنوەر کۆچەر**

کۆپنهاک : **فەرهاد پیربال**

بۆکان :**فەتاح شەریفی**

سەردەشت :**بەختیارحەسەنی**

تاران : **عەلی سدیق تۆفیق**

کرماشان : **محەممەد کەریم جەوهەری**

بەندەرعەباس : **جەعفەر هەمزەیی**

خانێ: **سەید نەجمەدین عەبدوڵڵا پوور**

نەغەدە: **دیاری غەفووری**

بۆکان : **ئەحمەد رەحمانی**

بوکان : **نادر مستەفازادە**

بانە : **عەلی حوسێنی**

بوکان: **شەریف عەرەبی**

خانێ : **عوسمان مستەفاپوور**

سنە : **عەلی خانی**

شنۆ : **خ ـ ساڵح**

مەهاباد: **یووسف قازی**

سنە : **فەرزین ئەسەدی**

خانی: **عەلی پورش**

# خانووی تازە....؟!

تەنزی کۆمەڵایەتی

ئەحمەد مەولانی

زۆر لەمێژبوو پێوەبووم بچمە ماڵی سولەیمانی هاواڵم. بەڵام لەبەر کار و باری زۆر وتێکۆشان بۆ لە نێوبردنی تەنگ وچەڵەمە – کانی ژیان ، هەلێکی وام بۆ هەڵنەکەوتبوو. پاش نیوەڕۆی ڕۆژێکی هەینی مانگی گەلاوێژی هاوینی رابردوو لێ بڕا مهەرچۆنێک بێ ئەو کارە بکەم .

سولەیمان هاواڵی زەمانی قوتابخانەم بوو . زۆرمان یەکتر خۆشدەویست .ساڵێک لەمەوبەر بوو کە ئەو لێ بڕا خانووبەرەیەک دروستبکات . دوای ئەوە دەستی بە سازکردنی خانووبەرەکەی کرد . زۆر جاران لەنێو شاری تووشی دەهاتم . دەمدیت کراس و پانتۆڵێکی کۆن و تۆزاوی لەبەردایە و ریشهاتوو سەر ئاڵۆز خەریکی کڕینی خشت وسمیت وئاسن و گێچ و قسڵ و کەرەسەی پێویستی ترە بۆ خانووبەرەکەی. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا تاو سووتاندبوی و تەواو رەش هەڵگەڕابوو. هەر فیکەی سمێڵی دەهات و دەیگوت :

کوڕەکاکە ئەگەرخانووی خۆم هەبێ نانیش نەبێ بیخۆم قەیدی ناکات! بەس نیە لەدەستکرێ نشینی نەجاتم دەبێ !

نێزیکەی مانگێک دەبوو سولەیمان ماڵەکەی گوێزتبۆوە و چووبووە نێو خانووەکەی خۆیەوە. جابۆیە پێویست بوو پێوەی بچم ولەنزیکەوە پیرۆزبایی پێ بڵێم .

هەرچەندە گیرفانم بەتاڵ بوو بەڵام نەدەکرا بە دەستی بەتاڵەوە بچم.جا لەبەر ئەوە سەرەڕای پرتە و بۆڵەی خێزانم دەستم دا ئەوئاوێنە گەورەی دەمێک بوو کڕیبووم بەڵام لەبەر بێ جێ و رێ یی وەبەر دەستانمان نەخستبوو .

سەرتنەیەشێنم ساز بووم و بەرەو ماڵی سولەیمان وەڕێ کەوتم. ماڵەکانمان ئەوسەرەوسەری شار بوون . بە پێ یان نەدەگەیشتمێ. سواری تاکسی بووم. بەڵام کاتێ دابەزیم هێشتا مەودایەکی زۆری مابوو بگەمە ماڵیان .تاکسی لەبەر کەندوکلۆی رێگا نەیدەتوانی چی دیکە بڕوا. ئەوجار بە پێ یان ملی رێگام گرت . لە چەند کۆڵانێک تێپەڕ بووم وپاشان لە شەقامێکی گەورەی پڕ لە

خۆڵەمڕە پەڕیمەوە و پێم نایە ناو ئەو مەڵبەندەی کە وا لە لایەن " سازمانی زەمینی شاری"یەوە درابوو بە خەڵک بۆ دروستکردنی خانووبەرە.

ئەو جێگایە بەیەرقەدی کێوێکەوەیە کەهەتا نیوەی کێوەکە کراوەبەخانووبەرەی دوو نهۆم وسێ نهۆم. جا کەوابوو دەبوا چەکەی ملم بکێشم و بە بارەوە لەو هەورازە وەسەر کەوم. هێزم هێنا بەر خۆم وڕێ کەوتم. کۆڵانەکان پڕبوون لەقوڵکەو کەندەڵان و گابەردی زەلامکە لە کێوەکە هەڵکەندرابوون و ڕێگایان لە ڕێبوار بڕیبۆوە. هێشتا زۆر نەرۆیشتبووم کە ئارەقەم کرد و وەهەناسەبڕکی کەوتم ناچار برێک ڕاوەستام هەتا ماندووم بحەسێتەوە.دیسان کەوتمە ڕێ.سەرتان نەیەشێنم بە چوارپێنج وچان گەیشتمە کۆڵانەکەی ماڵی سولەیمان. ماڵەکەیانم نەدەزانی کامە درگایە. پێنج شەش منداڵ لەبەر دەرکی ماڵەکان لە سەر کۆما خیزێک خەریکی کایەکردن بوون. لەوانم پرسی یەکیان گوتی:

ئەو کاک سولەیمانەی کوڕەکەی نێوی هێرشە؟گوتم: ئەرێ وەڵڵا ڕاست بۆخۆیەتی. گوتی:

هۆو درگارەنگ نەکراومیە کە لە سەرووی هەموو ماڵەکانەوەیە!

لەدڵی خۆمدا گوتم ماڵت ئاوەدان بێ خۆتۆ چوویە کێوی قاف! کوتام‌ورۆیشتم گەیشتمە بەردرگاکە بەڵام ماندوو هیلاکببووم‌دەتگوت لە گەڵی کورتەکی وەسەر کەوتووم.

لە درگامدا هیچ باس نەبوو. دیسان لە درگام داوە کەس جوابی نەدامەوە کەمێک لە درگاکە دوور کەوتمەوە وروانیمەپەنجەرە و دەلاقەکان.سەری منداڵێکم دی کە لەگەڵ چاوی بەمن کەوت سەری بردەوە ژوور و هاواری کرد:

بابە ،،بابە، کاکحوسێنە کاکحوسێنە! پاش ماوەیەک سولەیمان بۆخۆی درگاکەی لێ کردمەوە. پاش سڵاو و چاک وخۆشی چووینە ژوور هێشتا دانەنیشتبووم.هاوارم لێ پەیدا بوو گوتم:

کاکە لە توونیان خنکام چۆڕێکم ئاو دەنێ!

منداڵەکانی لە دەورم دانیشتن و سولەیمانیش رۆیشت.دوای ماوەیەک گەڕاوە و لیوانێکی ئاو بۆ هێنام و گوتی:

زۆر خەجاڵەتم‌سەهۆڵمان نیە ڕەنگە ئاوەکەمان زۆر سارد نەبێ!

ئاوەکەم لێ وەرگرت بەڵام گەلێکم پێ سەیر بوو! چۆن دەبێ ئاوی ساردیان نەبێ؟! پیرۆزبایی خانووبەرەکەم لێکردوگوتم:

لێتان موبارەکبێ بە سەرودڵی خۆش. نانی حەجی تێدا بخۆین ئیشەڵڵا.......
هێرش و هێرۆ و هیوا هەرسێکیان گوێ یان دابووە قسەکانمان و چاویان لێ نەدەترووکاندین. چاوێکم لە وڵاتگێڕا هەتا بزانم خانووبەرەکەی چۆن ساز کردووە. ئەو جێگایەی لێی دانیشتبووین هاڵێکی گەورە بوو کە هەموو دیوەکانی دیکەی لێ دیار بوو. دیوارەکان بە گێچێکی بۆر و ناشیرین گێچ خاک کرابوون. درگای دیوەکان بە ڕەنگ نەکراوی مابوونەوە و پەنجەرەکان ژەنگیان هێنابوو. هەموو دیوەکان جگە لە هاڵەکە و وەتاغێککە مۆکێتیان تێدا ڕاخرابوو چۆڵ بوون و هیچیان تێدا نەبوو. پێم سەیر بوو، لەخۆم دەپرسی بۆچی تا ئێستا دیوەکانیان ئاوەدان نەکردۆتەوە و شتەکانیان ڕانەخستووە؟! سولەیمان بۆوا دژ داماوە؟ منداڵەکانی بۆچی ئاوا کزو مات و بێ گەشە و نەشەن؟! خێزانی بۆ دیار نیە؟ وڵات بۆ وا شپڕێوە؟ ئەو پرسیارانەم بەدڵ داهات بەڵام لەرووم هەڵنەهات

لێی بپرسم. جا بۆ ئەوەی سولەیمان لەسەرسوڕمانە- کەم نەگات و دوایی بە بێ دەنگی یەکە بێنم لە بارەی ساز کردنی خانووبەرەکەیەوە دەستم کرد بە پرسیار کردن. سولەیمان پاش برێک رامان گوتی :

وەڵڵاهی کاکە خۆ راستە ئێستا لە خانووی خۆم دام و کرێ خانوو نادەم ، بەڵام بریا هەر کرێ نشین بایەم و خانووبەرەی ئاوام لەو بەندەنەی نەبوایە!! بە بیستنی ئەو قسانە واق ورمانەکەم لێ بوو بە سەرلێ شێواوی. تەواو حەبەسام مەگەر سولەیمان تەنیا ئاواتی لەمێژینەی ئەوە نەبوو منداڵەکانی لە خانووی خۆیدا هەڵسووڕێن ؟ ئەدی ئێستا کە ئاواتی وەدی هاتووە ئەو قسانە چیە دەیکا؟ درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی :

بەڵەشی ناخێرم ویستم خۆم لە کرێ نشینی نەجات بدەم کەچی ئێستا لەدەست قەرزداری وەختە هەڵێم و روو لە کێوان کەم. هەزار رەحمەت لە قەبری پێشینیان چاکیان گوتووە :

" قەرزداری گولی یە " کوڕە خۆناوێرم بە راشکاوی بچمە نێو شاری. بەسەری تۆ بەزاتی خودای درۆی تێدا نیە. دوێنێ هێرشم لەگەڵ خۆم بردە دووکانێکی وێنەگری هەتا وێنەی بگرم بۆ قوتابخانە . لەنێو دووکانەکە چاوم لەوێنەکان دەکرد لەپڕ چاوم بەوێنەی کابرایەکی ناسیاو کەوت هەر ئەوەندە بوو دڵم نەتۆقی. وەکوو بەرق بمگرێ یەک بەخۆم هەڵبزیمەوە!

پاشەوپاشکشامەوە و لە دووکانەکە هاتمە دەرێ! ویستم هەڵێمەوە بۆماڵێ و خۆم بشارمەوە! بەڵام لە نەکاو هەر وەکوو لە خەو راپەڕم تێگەیشتم کە ئەوە وێنەی کابرایە نە خودی ئەو! دوو مانگ لەوەپێش شووشەم لێ کڕیبوو بۆ ئەو بەقوڕێ گیراوە و نزیکەی دوو هەزار تمەنی پێ قەرزدار ماوم! حاڵی بووی کاکی خۆم خانووبەرە ئاوای ترسەنۆک و خوێڕی کردووم . نامەوێ بەدەردی خۆمەوە تۆشتووشی ژانە سەر کەم بەڵام بۆ ئەوەی برێک مەبەستت بۆ روون بێتەوە پێویستە مەسەلەکەت بەکورتی بۆ بگێڕمەوە .

سیغارێکی داگیرساند و بەهێرشی گوت: رۆڵە برۆ بزانە سەماوەرەکە نەکوڵێ؟ چایەک بخۆینەوە .

پاشان بە نارەحەتیەوە دوو مژی توندی لە سیغارەکە دا و گوتی :

بۆخۆت دەزانی ئەو پووڵەی وەری دەگرم بەحاڵە حاڵ پێی بەرێ دەچم و هیچم بۆ پاشەکەوت ناکرێ. کەوابوو ئەمن بێ ئەوەی پووڵێک بە خۆمەوە شک ببەم دەستم بە قوڕەکاری و خانووبەرە ساز کردن کردووە. کاتێک زەمینم وەرگرت و دەست بە کار بووم هەشت نۆدە هەزار

تمەنم هەبوو. چوومەوە ئاوایی بۆلای بابم بەڵکوو وەکهەمیشە یارمەتێکم بدات. ئەویش‌دەستی بە رووە نەنا ولەودوومانگا-یەی هەیبوو یەکیانی بۆ فرۆشتم وپووڵەکەی دامێ. خێزانیشم بڕێکی زێڕ هەبوو فرۆشتمان. بەو پووڵانە کە نزیکەی هەشتا هەزار تمەن بوو بناغەی خانووبەرەکەم داڕشت و لەخەندەکم دەرهێنا چونکە دەبوو هێندێک لە کارەکانی بکەم جا ئەوجار بانکوامی دەدامێ. پاش ھاموشۆیەکی زۆر بە چوار جاران سەدوپەنجا هەزار تمەنم وەرگرت. بەلام بەو پووڵەش کاری خانووبەرە-کەم تەواو نەبوو. پەنامبۆ یەکدوو کەس لەهاواڵەکانم برد. ماڵیان ئاوەدان بێ لەگەڵ تۆ دەستیان گرتم کەچی خانوو هەر دوایی نەهات. ئەوجار دەستم کرد بەشت‌فرۆشتنی نێوماڵ. فەرش و تەلەویزیۆن و یەخچاڵ وبڕێک‌کەل وپەلی دیکەشم فرۆشت وهێندێکیش بە خەڵکی قەرزدار مام.لە ئاکامدا خانووبەرەکەم ئەو جۆرەی کە ئێستا دەی بینی بۆ تەواو بووە. هەڵبەت بەرق و ئاویشم بۆنەکێشراوە لەو ماڵانەی جیرانمان ئاو دێنین و لە عەمباراوی دەکەین.شەوانەش لەبەر چرای گرسۆز دادەنیشین.

حەوتووی رابردوو بە خێزانم گوت‌ئەو جووتە گوارە زێڕەی ماوتە بمدەیە بی فرۆشم. بەلکوو ئیمتیازێکی ئاوی پێ‌وەرگرم بەلام هەرچی حەولمدا بۆم رازی نەبوو.

چت‌لێ بشارمەوە لەسەر ئەو مەسەلە بەشەڕ هاتین و لەو دەمەوە تۆراوە و ئەو مندالانەی‌بەسەردا بەجێ هێشتووم.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو مندالەکان دەستیان کرد بە گریان و فرمێسک‌هەڵوەراندن بۆ دایکیان.سولەیمانیش‌دڵی پڕ بوو بەلام بەبیانووی چایی هێنانەوە هەستا رۆیشت‌بۆ دیوەکەی دیکە.

کاتێ ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنەم بیست و گریانی ئەو مندالە بەستەزمانانەم چاو پێ‌کەوت، غەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرتم هێندەی نەمابوو ئەمنیش وێڕای ئەوان دەست‌بکەم بە گریان بەلام هەر چۆنێک‌بوو خۆم راگرت و مندالەکانم ژیر کردەوە. بڕێکیشم دڵ خۆشی سولەیمان داوە و پاشان چایەکم خواردەوە و هەستام.

تەنیا کارێکی توانیم دەرهەق بەو هاوالە خۆشەویستم و مندالەکانی بکەم ئەوە بوو چووم بۆ ماڵی بابی خێزانی سولەیمان و بڕێک‌بەسەر براژنە مەنیج داهاتم و لەگەڵ خۆم هێنامەوە بۆ ماڵی خۆیان.

لەپێشدا داران بە**کێلێز** دەچەقێنن . وەکی دەزانین کێل(**لـــا**) ئاوایە. و ئەگەر سەروبن کرێ (ـــ) ئاوای لێدێ. یانی دوو داری دمدوولک کە بەرینایی هیندێک لە بەرینایی چیغ پترە دەچەقێنن وچەڵەکەیەکی داوێنە سەر.

بەرزایی کێلێز دەبێ ئەوەندە بێ کەچیغ کەردەستی بگاتێ. بەڵام بەعام **بەرزایی چیغ گەزو نیوێکە و بە مەودای دەسانت ریزێکی بەن تێهەڵدەکێشن** . چیغ هەتا بەنی پتر تێهەڵکێشن "**بەکرتر**" یا بە پشت تر دەبێ .

**بەردە چیغ :**

بەردێکی لووس و درێژە ولەبارە وبەقەت قولانجی مێرمنداڵێک درێژە و بۆ گلۆلەبەن هەڵکردن بەکاردێ.

ئەم جۆرە بەردە لە چۆم و-دەراوان زۆرە.

**شێوەی گلۆلەهەڵکردن :**

دوو سێ گەزبەن لە بەردەکە داڵێنن وقوڵفەی

بۆسازکردنی چیغ لە پێشدا دوو دوو لەیەکیان گرێ دەدەن ووەک تیر بەسەر چەڵەکەی کێلیژیاندا ، دێنن .

چیغی ئاسایی سێ گلۆڵە بەنی دەوێ .پازدە لەمدیوو پازدە لەو دیو. بۆ ئەوە بەنەکان لەریزی خۆیان نەترازێن دارچەڵە لەشوێنی بەنەکان لولە دەکەن.هەوەڵ شووڵ بە ئیشتیای خۆیان لە بەنەکان قایم دەکەن بەڵام بۆ شووڵەکانی دیکە هەموو جارێ گلۆلەکان بەسەر دارچەڵەدا ئەمدیو ئەودیو دەکەن، دەنا وەختی ئەمدیو ئەودیو کردنی گلۆڵە وە شاتلۆرە دەکەوێ و لە بەریەک هەڵدەوەشێتەوە. جا پێدەکەن. بەمجۆرە تا دێ چیغ زیاد دەکا . وەختێک گەیشتە نێوەراست دەڵێن **نیوەبەر** وکاتێک لەسەر

کێلیژڕا گەیشتە عەرز دەڵێن **بەرێک** تەواو کراوە. بۆجوانی هەموو بەر و

نیوەبەرێک لەجیاتی قامیش چوار پێنج سوورە شووڵ دائەنێن. ئەم شووڵانە بەرجی ئەوە چیغەکە دەنەخشێنن، زۆریشی قایم دەکەن.

لە کوردستان شووڵ و قامیش بڕین کاری پیاوانە، **چیغ کردن کاری ژنانە.**

لەم شوێنانە کە هێشتا چیغ کردن ماوە پایزان کچ وەبەر ناکەون و هەر رۆژە لە ماڵێک بە گەلەکۆمە چیغی ماڵێک تەواو دەکەن. بەمجۆرە تا هەوار چیغی هەموو ماڵان حازر دەبێ.

**جۆرەکانی چیغ :**

**چیغی کرتوو:**

جۆرە قامیشێکی نێو پڕە تا بڵێی جوان وڕێک ولووس ولەبارە، بەڵام لە هات و چۆدا قورسە. **کرتوو** لە مەڵبەندی ئێمە لە دەم رووباری «ژاراوێ» شین دەبێ ماڵێکی دەستی بڕوا چیغی کرتوو ساز دەکا. گەڵای کرتوو وەک کەوەری یەکساڵە دەچێ وپیاو بەزەحمەت لەگەڵ **سێ سو** لێکی دەکاتەوە وهەروەکی ئەویش

بۆ باقەبێن دەبێ.

بۆ سەری گیشە وقۆری بەکەلکە وئاو نادەڵێنێ. هاوینان کۆل کۆل و پۆل پۆل نێری دەکەوێتێ و لە باڵی پیاو بەرزتر دەبێ.

**سوورە چیغ:**

لە قامیشی نێوکلۆر ساز دەکرێ. زۆر جوانە و بۆ هات وچۆ سووکە. بۆوەی قایمتر بێ هەموو نیوەبەران چوار پێنج سوورە شووڵی لاوێنی تێهەڵدەکێشن. جوانترین نەخش بۆ ئەم جۆرە چیغانە، **نەخشی شیرو مەتاڵە** کە کچە چیغ کەر سازی دەکەن. وەستایانە بەنەکان راست وچەپ، ئەم دیو ئەودیو دەکەن ونەخشی شیرومەتاڵ دەکەوێتە **کرەکە- یان.**

**چیغی زڕبیزا :**

**زڕبیزا** گیایەکی کوێستانی یە. دۆپێ واهەیە گیا دروەکەی زڕبیزا دێنێ کە ماڵات کەیفی پێی نایە. هاوینان وەختایەکی لەوەڕ ناخۆش دەبێ بزن بە نابەدڵی گەڵاکەی دەقرتێنێ. نێرتکەکانی

یەک یەکە بۆچیغ دەبن*. زۆر قورس و نالەبارە و چیغەکەی چیغی ناعیلاجی یە. بۆ ئەوە کە زۆر دزێو نەبێ نێوە نێوە لاوێنی داوێنی .

**لاوێن :**

چەشنەبێ یەکی شلک وباریکە کە زۆرتر لەدم رووبار شین دەبێ وکەمتر بۆ ئالوو

دار دەبێ .

**چەتان :**

جۆرە چیغێکە لە شووڵ ساز دەکرێ. بۆ سازکردنی لە بەنی ئەستوور و شووڵ کەلک وەردەگرن. لەهەرێمی دەشتەکی دەیکەنە **وارشی عارەبە** وترێلی تراکتۆر و بۆکێشەوی **کاوگزرە** کەلکی لێ وەردەگرن.

تا چیغ دوایی نەیە کاریان بە رێک وپێک کردنی سەروبنی نیە. وەختێک تەواو بوو سەروبنی لەسەر کۆلکەدارێک دادەنێن وبە **تەشوێ خشتی دەکەن**. ئەمجار کۆنەکوێنێک دێنن و بە بەرینایی **کەژوو** دایدەدڕن و **سەروبنی چیغی پێ کۆبە دەکەن.**

(دەسەروبنی چیغی هەڵدەدروون)

ئەگەر چیغ **کۆبە** نەکەن بنی لەعەرز دەخورێ و دەسوێ و سەرەوەشی وەختی باوباکوت دەکوێن هەڵدەچەقی ودەیدڕـ ێنی .

**فڕفڕینگ یا بەروێنچکە**

تاوڵی واهەیە هەشت چەڵەکەیە. دیارە دەبێ زۆر قورس وگەورەبێ وگواستنەوەی گەستەمە. لەبەرئەوە سەرتیکی* لێ نادروون تا بتوانن بە دووکەرەت رایگوێزن لە راستی سەرتیک نێوە نێوە لوولاکە حەیوان قایم دەکەن و لەبەرەکەی دیکەش هەر بەمنێوانە قولفە بەنی داوێنێ. لەکاتی تاوڵ هەڵدان **قولفە** ولوولاک لێک قایم دەکەن و بەم جۆرە چادر دەبێتە یەکسەری.

**کەپر :**

**کەپر** سانی ترین وهەرزا نترین سەرپەنایە کە هەموو کەس دەتوانێ سازی بکا، بەو مەرجە هێندێک خۆ ماندوو بکا .

**کەپر** پێویستی بە چوار کۆڵەکەی سەربەدوولک هەیە هەتا کۆڵەکە پتر بێ کەپر قایمتر دەبێ. بنی کۆڵەکەکان وەک مەزرەق دادەتاشن .

عەرزی بۆ هەڵدەقەنن بەڵام بۆ ئەوە کەقوولکە- کان لەرادەی پێویست بەرین تر نەبن بەدمە خاکەنداز هەڵیدەقەنن. ئەوجار بنی کۆڵەکەکان لە قوولکە دەنێن وبەردی بە بەرەوە دەکوتن تا شەق راوەستێ و لەقە نەکا .

هەرکە کۆڵەکە بنەگر بوو دارچەڵەی داوێنە سەر و دوایە داری بەسەردارایەڵ دەکەن. ئێستا کەپر قایمە و یەک دەتوانێ بچێتە سەری و تێک نەقرمێ. جا ئەوجار وردە وردە لە خوارەوەڕا، چرپی ولقەداری بەگەڵاوە دەدەنە دەست کابراوئەویش بانی کەپرەکەی پێدادەپۆشێ.

بۆئەوە باو باکوت چرپی یەکان نەڕفێنێ بەردی پان پانیشی لەسەر دادەنێن.

**کەپر لەتاوڵ فێنکترە بەڵام لەحاند رێژنەبارانی بەغوڕەمدا چی پێ ناکرێ**

ئەحمەد بەحری

زمان ئەو ئامرازە گرینگە خواپێداوە، وێنەی دارێکی پڕ لک وپۆیە. بێتو خزمەتی نەکرێ، کلۆڵ* دەبێ وئیشک هەڵدێ. دیارە ئیشکەڵیش ئاخری دەکەوێتەبەر تەوری زەمان ودێ بەتووشی تەندووری فەوتان. داری بێ پەرژینی زمانی کوردی، هەروەک ئەو داربەڕووەی لەلێڕ رووا وە و چنگی لەبەندەن داکوتاوە وەیا ئەوگەنمە خێرۆکەی* کە بەبێ سەرافەتی خاوەنی هەموو ساڵێ بەنم نمی بارانی رەحمەت دەبووژێتەوە، هەتا ئیمرۆ خۆی راگرتووە وبەختەوەرانە نەبۆتە کلۆی سەر قەننەوچەقەنەی ئاش، بە ناشکوری نەبێ ئێمە نەئەو نەتەوەین کەنووسەری هەندەران بەشانازی یەوە نشانگەکانیان بەزمانمان نووسیبێ وەنەئەو نەتەوەین کەبەسێ سەدوچوار سەد شاعیر شێعریان پێ هەڵبەستبێ. بەڵکە ئەو نەتەوەین کەهەتا ئەو سەروبەندانەش تەنانەت نووسەرانی خۆماڵیش ناموێی* یان لێ دەکردین ولێمان دەپرینگانەوە! ئەگەر تاق ولۆقیش هەڵکەوتبا تەگەرەی* پڕ سەمەرەی دەخرا سەر رێ ولەرێ بەدەر دەکرا. دیارە هەر زمانێک هەل ومەرجی ئاوای بۆ بێتەپێش ئاڵ وگۆڕی بەسەر دادێ. ئێستا ئێمە ئەو ئاڵ وگۆڕی یە لەشارەکانماندا بەجوانی هەست پێ دەکەین. ئەوەی ئیمڕۆ ئەوان پێی

دەئاخوێن تەنیا قاپۆڵکی زمانەکەمانە! بەختەوەرانە ئاخاوتنی گوندییەکانمان نەگەیوەتە ئەو قۆناغە. ئێستاش بۆ ئەوە دەبێ پشتی پێ ببەستی وبیکەیە شارە. زمان لەدێ داپوختوپاراوی خۆی کەمتا کورتێک پاراستووە بەیت وباوەکان هەروا بەرمێنن .ئێمە ئەگەر دەمانەوێ زمانێکی پوخت وپاراوی ئەدەبیمان هەبێ پێویستە رووبکەینە گوندەکانمان، شێوەئاخاوتن وبەیت وباوەکان رەچاوکەین وکەلکیان لێ وەرگرین وبە زمانی ئەوان بنووسین.هەتا بتوانین هێدی هێدی بەرەو دوندی بەرزی ئەدەب تێهەڵبینەوە. ئەگینا تووشی ئەو قەرقەشوسەرلێشیواویە دەبین کە ئەوانی تر تووشی هاتوون وبۆ خۆشیان لە خۆیان حاڵی نین،چ بگا خەڵکی تر، وێدەچێ گوندکانیش بە دەردی شارەکان بچن .یەکێک لە بەڵگەکانی ئەم قسەیەم دوایین پشتی بەیت بێژانە بەداخەوە نەسلی داهاتوومان لەو هونەرمەندانە بێ بەش دەبێ. ئەو هونەرمەندانەی کەهەست ونیستیان بەیتە و شوێنێکی یەکجار گرینگیان خستۆتە سەر زمانەکەمان ( بەتایبەت سەرشێوەی موکریانی). ناساندنی بەیت بێژان چەند قازانجی بنەڕەتی هەیە کە دەتوانین قامکیان لەسەر دابنێین ، بۆوێنە هەست بەئەمەگداری کردن وڕێز لێنان لەم هونەرمەندانمان هەروەها ناسینی ئەوهونەرمەندانە بەبەرەی داهاتوو کە بە گوتنێ لەنگەریان بە تەیران دەبەست . کەوایە وەرن بۆ پاراستنی کەلەپووری نەتەوایەتیمان تێ بکۆشین.

ئەو بەیت بێژەی کەئەمجارە پێتان دەناسێنم ، بێجگە لەوەی یەکێکە لە بەیت بێژە هەرەگەورەکان ، هاوچەرخ وهاونشینی زۆربەی بەیت بێژەکانی ئەم سەدەیەی ناوچەی مەنگوڕی مەهابادیشە. لەسەرەتای هاوینی ساڵی١٣٦٥ چووینە خزمەتی وت و وێژمان لەگەڵ کرد . گەرچی ئێمە مەبەستمان سەرگوزەشتەی خۆی بوو ، بەڵام ئەو زۆرتر لە بەیت بێژانی کۆن دوا! ئەوەش کورتەیەک لەو وت و وێژە :

بە" حاجی ساڵەتەورە"مەنشوورم" ماڵم لەگوندی"قۆزلو"ێ چووکە . لەگوندی " کیتکە " لە دایک بوومە . بابم نێوی مینەیە ودایکم نێوی خانمێیە نیزیک ٩٥ساڵم تەمەنە سەرێکی لە"بەرەجۆ" بووین، لەوێرا چووینە " خەلیفان"١٥ ساڵ لەوێ ماینەوە ،دیسانچووینەوە کیتکە . هەروا لەو بەینە رامان بوارد هەتا لێرە گیرساینەوە ( واتا :قۆزلوی چووکە ) .هەر لەسەروبەندی منداڵییەوە بەیتم گوتووە بەجعێڵی بۆداوەتانیشم دەگوت .زەینێکی چاکم هەبوو ئەوەی بەڕۆژ بیستبام بە شەو هەمووم وەبیر دەهاتەوە. لە بەیتەکان زۆربەیان دەزانم جارێکی کابرایەکی ئەڵمانی هاتبووە قۆزلوێ گەورە. لە دوایان ناردم، چووم بۆمگوت ئەویش زەفتی کرد وبردێوە ئەڵمان، بیست ساڵ دەبێ.

دەکرێ بفەرمووی لە. بەیتەکان کێهانە دەزانی؟و ئەوانە لەکێ فێر بووی؟

لەبەیتەکان کاکەمیروکاکە شێخ، خەج وسیامەند، سایل محەممەد حەنیفە، سەیدەوان، مێرو وەفا ،شێخ فەرخ، مەحمودەشۆڕی مەرزینگان، سەعیدومیر سێوەدین بەگ، لاس وخەزاڵ، گەلۆ، سوارۆ، عازیزە، پایزە، شەوونیوەشەو گوڵەجوان، ناسروماڵماڵ شێخی سەنعان ..........دەزانم بەیتی سەعید ومیرسێوەدین بەگ لە" مەندە" فێر بووم شوعەرای وەک مەندم کەمدیوە خەڵکی "لاجان"ێ بوو. هەرچی خودا داناوە دەیزانی کەس دەنگ وئاواز وسەدای ئەوی نەبوو.

مەندە زۆرمەنشووربەیتی لاس لە " ئەحمەدەکوێری کاڕەسووی" فێر بووم لە " یەڵتەمر"ی مرد. مێروووەفا

مستەفا عەیزقۆیلەری" فێر بووم. خەڵکی "گردەبەردان" بوو، خۆش خوانێکی کەم وێنە بوو. سەیدەوان لە" عەولا، کۆڵی خدرشەمێ" فێربووم قەدیم خەڵکی " یەڵتەمر"ی بوو، لە " کولتەپە"مرد.خەج وسیامەند لە " عەولا گۆج " فێر بووم، شارویرانی بوو پێم وایە خەڵکی "دارەلەک"ێ بوو.گەلۆلە ئەحمەدکەپۆسووری کانی رەش" فێربووم. بەیتی شێخی سەنعان لە "سەعیدی نادری"وە بەیتی محەممەد حەنیفەلە" حەمەقازی" فێر بووم. خەڵکی "خەلیفان"بوو لەکێنتکە عەمری خولای کرد. ناسرو ماڵماڵی چاک دەزانی. بەیتی کاکە میرو کاک شێخ لە برایمی شەریفی" فێر بووم. بەیتی سایل لە" وسووی سمایلێ" فێربووم ،خەڵکی "بەرەجۆ بوو ئەویش مردووە.

- حاجی بێجگەلەئەوکەسانەی نێوت بردن، کەسی دیکەت پێ شک دێ کەبەیتی چاک زانیبێ؟"

- ئەڵڵا قیتک"م دەناسی خەڵکی " بێکۆس "بوو.چاکی دەگوت.عازیزە هەرلەزاری ئەو خۆش بوو. هەرچی مەدحی بکەی کەمە. ئەحمەدی شەنگ هەر ئەو گوتبای. ساڵێکی هاتبۆوە دیوەخانی خەلیفانێ.ئەمنیان برد هەتالێی فێربم.حوسێنی مینەی کوێخا ئەڵلا" خەڵکی خەلیفان بوو. پێم وایە هەر لەوێش مرد. "عەولای ئەحمەد قاسمی" بەیتی شۆڕ مەحمودی مەرزینگانی دە گوت خەڵکی "داربەسەر"ێ بوو.دوایەهاتە" دارەگردەلەی". ئەگەردەیگوت دەستی داویشتە سەر دەسکی خەنجەرێ. هەرشیرن بوو. بیلێ.لەمێژ مردووە.

"ئەحمەدی مەلای مۆتانی "م دەناسی. دەتوانم بڵێم دەنگی وەک حەزرەتی داودبوو.گوتن هەر بۆئەوی دەبوو. " مام رەحمانی ئاختەتەری" ،"رەحیم شایەری قەباغکەندی" ،وسامە کوێری خەلیفان" ،"عەلی حەیران" کەلە کاسەکەران مرد،" کەریم مل خوار بەیتی کاکەمەمی چاک دەزانی. " کەریم شێخ لەری " بەیتی جوولەکانی دەگوت، " مام نادر" ( نادرە کوێر ) خەڵکی خەلیفانێ بوو.بەیتی سەیدەوان وپایزەو.... چاک دەگوت.دەنگی زۆر خۆش بوو ودەرویش حەمەدی قەرەداغی " هەمووکەس دەیناسێ، هیچکەسی ناگاتێ.

- "حاجی داوای تەمەنێکی دوور ودرێژت بۆ دەکەین و هیوادارین هەتا دەرفەت ماوە ئەو گەواهێراتانە بخرێنە سەر شریت ولە فەوتان رزگاریان بێ"

فۆڕمی ئابوونمان ژمارە

ناو...........شۆرەت.........دانیشتووی.................

...... تمەنم بەحیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ورمێ گرت و فیشەکەم وێڕای ئەم بەرگە بۆ ناردن. لەژمارە.......ڕا هەتا.......گۆواری سروەم بۆ بەڕێ بکەن.

ناونیشان.................................................

......................................................

# ئێوەی ئەدەبی

مەهاباد: یوسف رەسوولی
نازانین ئەوە شیعرە یا پەخشانە؟
کەسێک کەنازی منی دەکێشا
دایک بوو
کەسێک کەگەنجی دونیای بە
من سپارد باوک بوو
کەسێک کەنیوەشەوبەدەنگی
گریانی من
وەک ئەسکەندەر رادەپەڕی
دایک بوو

... : عەلی پەناهی
شیعرەکانت گەلێک جوانن لەسەر کێشی خۆمالین. بەلام بەداخەوە درەنگمان پێگەیشت ووەختی بەسەر چووە. ئەوە بەشێکی چاپ دەکەین.

بولبول دەخوێنێ دڵ
دەبزوێنێ
غونچەی باوەشی گوڵ
رادەژێنێ
گوڵ بە نازەوە بۆن
دەپرژێنێ
پەپوولەی شادی
دەهارووژێنێ
چاوەڕێی یارە دڵی
بێقەرار

عەلی شوکری:
شیعرەکەت لە باری وەزنەوە کەموکووڕی هەیە وەک:
نە هاژەی ماشێن نە
زرنگەی زەنگ
شارشار خامۆشان بازار
بێ دەنگ
یا:
دەمەوێ بزانم کێ وای
کردووی
کەوا سەرتاپێ تەواو
دامردووی
هێندێک جێگاش مانای نایە وەک:
بەتەرزێک ناجۆر زوڵمی
لێ کرام
لە هێندێک جێگا قافیەش لەبەرچاو نەگیراوە وەک:
بەسەهات وبەسەرهات
تێکرا و رێژا
ئاوارمان و دووکان
لانکدا وبۆرتمان کرا

تلفن ۳۵۸۰۰

چون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروزووری ولات بە نامەی جوان ورازاوە داوای "فۆرمی ئابوونمان"یان کردووە، ئەوە چۆنەتی ئابوونمان لە دەروزووری ولات بەو شێوە رادەگەیەنین

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆنێو خۆی ولات | ۲۰۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ ولاتە دراوسێکان | ۳۸۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ هیند وئورووپا | ۴۲۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆئامریکاوخاوەری دوور | ۵۰۰ | تمەن |

ناونیشان: اورمیە ـ صندوق پستی ۷۱۷ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ۳۵۸۰۰
بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستگاکانی دەرەوە دەخوێنن (ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن) هەل و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت پێ بگا.

بایەوا ودایەوە

چاوەڕوانی شیعری جوانترین.

**عوسمان پشکۆ :**

بە بڕوای ئێمە ئێستا باوی ئەوە نەماوە خەڵک داوایەک بە شیعر بنووسێ بۆ وێنە فلان بابەت لە گۆواردا جێ بکەنەوە بەڵکوو شیعر هەستێکی دەروونی یە لە قالبی وشەدا بە ڕێک وپێکی دێتە دەر و قانوونی شیعری تێدا لەبەرچاو دەگیرێ .

**سەلاح عەبدوڵلازادە :**

برا گیان بەرجی ئەوە شیعرەکەت لەباری وەزنەوە لەنگە ماناشی نیە وەک :

**بخوێنە باقەدری هونەر**
**دەرکەوێ لەپشتی پەردە**
**چون لەمێژگوڵی هیوا**
**هەیەتی خەمڵانەوەیەک**

لەم چەند شیعرانەی تۆ کە تا ئێستا بە دەستمان گەیشتووە پێمان وایە تۆ ئەگەر بارێکی دیکەی ئەدەب جگە لە شیعر بگریە بەر دەتوانی باشتر وبەکەلکتر بنووسی .

**محەممەد قەهوەیی :**

برا گیان ئێمەش پێمان وایە بووژاندنەوە خۆشترە لە وشک کردن . ڕوان وگەشە کردن جوانترە لەدامرکان و سیس بوون .

شیعرەکەت زۆر پەرداخ ، نیە .لەسەر ئەوەشڕا چاپی دەکەین و داوەری دەدەین بە خوێنەران :

**لە شک دام**
**وەک شکی هەڵۆیەکی نەبەز**
**وەک ئاواتی بێ تاوانی،**
**ناو قەفەس**
**لە شک دام**
**بەڵام**
**لەپەلامار دەس هەڵناگرم**
**دەبێ ببێ دەنا دەمرم**
**دەس بکەوێ**
**ئاواتەکەم**
**وەدی بێنم من ڕەواکەم**
**غەزالەکەم**

**نافیع عەلایی :**

برا گیان لەنێو شیعرەکانتدا ئەم چەند شیعرەمان هەڵبژاردووە و هیواداریین وەک هاوکارێکی دڵسۆز یارمەتیمان بدەی و پێوەندی خۆت درێژە پێ بدەی.

**سروە سەمەری سەبری سەدان**
**سابت ووریا**
**سروە سەمەن ویاسەمەن و**
**سەرووسوڕەییا**
**سروە بەگوڕو گەرم وگورم**
**گوردی وڵاتم**
**سروە بەخەبەرهێنەرەوەی ،**
**هەستی خەباتم**

**شاروخ فەیزنیژاد :**

لەوە کە خۆت هەستت بە کەموکووڕی شیعرەکانت کردووە نیشانەی هەڵدان و گەشەی بیر و زانستی تۆیە کە بۆ ئێمە جیی شانازی یە .

لەبابەت پرسیارەکەشت کە نووسیوتە چ بابەتێک لە سروەدا چاپ دەکرێ ؟ دەبێ بڵێین سروە فەرهەنگی و ئەدەبی یە . چاو بە لاپەڕەکانی دا بخشێنە بۆت دەردەکەوێ چ جۆرە بابەتێک لە سروەدا چاپ دەکرێ .

نووسراوەکەتمان دا بە دەستەی نووسەران تا ئەگەر پەسندی کرد بۆچاپ ئامادە بکرێ .

چاوەڕوانی هاوکاری پتری تۆی بەڕێزین .

**عەلی پدرام :**

بەداخەوە ناتوانین شیعری فارسی چاپ بکەین .

لەبابەت پرسیارەکەشت :

بەڵێ وشەیەکی لەنگ و نالەبار لە شیعردا ئەگەر وەزنەکەی نارێک بکا بۆشیعر ئیرادێکی گەورەیە .

**سەیدکەماڵ لەتیفی :**

شیعرەکەت تەعبیری شاعیرانی کۆنی زۆر تێدایە . هیندێک شیعر مانای نیە وەک :

**لەبیری تاروئاڵۆزم مەهی**
**یارم لەوێ دیارە**
**کەبۆتە بووکی ڕازاوەوئیتر**
**نای بینمەوە دیارە**
**یاوەکوو پەندێکی ناخۆش با**
**بچێتەتەنگی گیرفانم!**

تائێستا کێ پەندی لە گیرفانی ناوە .

لە شیعری دووهەمتدا (هەستاند وورووشاند) و (بەرز وفەرز) و... قافیە نین.

چاوەڕوانی دیاری جوانترین .

کات ژمێر بەچرپ وکوت
تەقەلایەتی خۆی بگەیەنێتە
نۆو و نیو .

خەو لەچاوی وریای منالّ
زیز بووە .مەشقەکەی بۆ
نەنووسراوەتەوە و هەزار
بیری بە مێشکی دادێ .

ئێستەکەزوربەی هاوالّە-
کانی نوستوون ، وریای ژیر
لەبیری باوکی دایە کەبۆچی
وەک پار پاییزێ لەخەمی
سووتەمەنی‌وکەل وپەلی
سەرمادا نیە !

شەو پاییزی ئەمسالّ
دەلّێی لێفەی چڵکن وچەوری
بێ سنووری عاسمانی پێرە
کەخۆی بە عەرزی شل و بێ
تین داداوە و هەناسەی
لێ بڕیوە و جار جار
ئارەقەیەکی ساردی پێ دەکا
ووای بەلّێنی پێ دەدا کە
زستانەکەی سەختە و دەبێ
وریا بێ،بەلاّم عەرزی کۆنە
نەخۆش خۆڕاگرە وچاوەڕێی
زستانی تەڕە کە بێ و تاو
پۆی لێفەی چڵکن شی کاتەوە
و لۆکەی پیسی وەدەم بای
وەعدە بدا وئاداری بەسەر
پادارەوە نەهێلێ. روکارە
جوانەکەی بەهاری خۆی بە
خەلّکی بنوێنێ وئەوەندەی
لە توانای دایە خۆشی لە
دلاّن باوێ .بەخۆشی یەوەئەو
کارەش بەتوانا و هێزی
تەواوەوە بەجێ دێنێ .

ئەلّبەت تەبیعەتی جوان
پشتیوانێتی و دەستی
ئادەمیزاد لە حاندیدا
کۆلّە و غەیری مل کەچی چی
دی پێ ناکرێ !

خۆزگە لە هەموو شتێکی
جوان دا دەستی نابەکارکۆلّ
بوایە! بەلاّم بەداخەوە زۆر
جاران وانابێ وئەو پاییزە
ناخۆشەی کە هەموو سالّێ
لەبەر عەرز بەزیوە ئەمسالّ
تۆلّەی خۆی لە وریای بێ‌ناز
و منالّ ئەکاتەوە و لەچوار

دەوری حەساری خەمدەکێشێ
و خەونی ناخۆشی وەدی
دێنێ.ئەوەی کە باوکی لە
منالّیدا بەسەری هاتووە
وردە ،وردە لە داهاتووی
ناخۆشیدا سەر رێ بە وریا ..
دەگرێ .

بەلێ هەموو خەلّکی‌شارە
خۆشەکەمان لەبەر تەزووی
پاییز خەریکی وەکۆ کردنی
نەوت وسووتەمەنین ،بەلاّم
باوکی بەڕێزم چاوەڕێی تازە ،
بوکەکەبۆی بێتەمالێ وخێرا
لەبیری چووە کەقسەیەک لە
قسەنەدەگیرا دیگوت : تاوانی
بێ دایکی وریا لەمنەوەیەو
ئیتر ژن ناهێنم وتۆلّەی
ئەوە بۆوریا بکەمەوە کەلە
باوەشی گەرمی دایکی بێ بەش
بووە، بە خودای ناهێلّم‌تاقانە
کوڕەکەم نێوچاوانی ترش و
مۆڕی زڕدایک ببینێ ئاخر
بۆخۆم‌تامیم زۆرچاک چێشتووە
ئەرێ ، ئەرێ چاک دەزانم !!

وەختێک باو کم دایکی
تەلاّق داوپاش‌ماوەیەک‌زڕدایکمی
هێنا ،بۆماوەی دوو ،سێ حەو-
توویەک ریحانەوگولّی زڕدایکم
بووم تابۆنی پێوە نەکردبام
نەدەنوست .

تاکو رۆژێک قەندانێکم
لەدەست بەربۆوە وشکا ،بەپەلە
گەیشتەسەرم ،

- چی بوو عەلی؟
- دایەقەندانێکم‌شکاند!
- دایەی‌چی تولّەسەگ ! کەی
من دایکی سەگی وەک تۆم ؟لەم
ڕۆ بەم‌لاوە نێوی ئەودایکە
گلاّوەت بەسەرمن دا نەبرێ!
هەرپێم بلێ"باجی " بەس !
ئەمجارەش نۆبەبەخشت بێ
لەمڕۆبەم‌لاوە هەرشتێک بشکێنی
بۆخۆت دەزانی ومن ! ئەوەتا
ئێستا رووم داویەی خەریکی
پشوی لێ هەلّکێشی!
- خو...خو....دا......

دا .... خۆباجی بەئەنقەست
نەمشکاندوە زۆرم‌خۆش دەویست
ئاخر پارلەگەڵ دایکمان
کڕیمان.

- باشە- باشە چابوو شکا
ئەزیادگارە گڵاوەی دایکت!

ئەم‌قسەکەمکەم تەواوی
مێشکی داگرتم،لەخوێنم چزا
بەئازای بەدەنم داگەڕابوو
بە تاوپۆ دەوری دڵی تەنیم
لەگوێم راچوو بەدەست‌هەستم
پێ کرد.

وڕمابووم لەلەت‌وکوتی
قەندانەکە، ئەمجار بەتوندی
قیژاندی.

-زووبەفڕێ یاندە! بامن
دەستم بەوانە - گڵاونەبێ!

ئیەی خوێنم هاتەکوڵین
چاوم سووربوو- دەستم‌رەق بوو
قینم هەستا وهاوارم‌کرد بەس
بڵێ گڵاو. ژنەتیوەنالەبارە!

- چی چی! بەمن دەڵێی
نالەبار! دایکەواوالێ،
کراوەکەتە - یاڵڵا!

ئەمجار ئەمیش‌خۆم پێ دادا
مستی لێ دەم تفی لێ کەم،
ئاخ وئۆخی دڵی خۆی پێ دەرکەم
بەڵام،من چووک وئەو گەورە
ئەمن مەزلووم وئەو زاڵم
ئەمن بێ هێز وئەوبەهێز، من
بێ کەس وئەو پشت ئەستوور.
لەنێو دەستی داگیرم کرد
لەشم ئازاری‌هەست‌پێکرد کوا-
نێ دایکم زوو بمگاتێ؟کوانێ
باوکم لەفریام بێ؟

بەڵێ خەیاڵ زووتێپەڕبوو
دایک‌نەبوو بەڵام باوکم
هێندەی پێ نەچوو هاتەوە
پرسی: چی بووە عەلی؟

ئیتر جوابم پێ نەدراوە.
گریان وقینم‌تێک‌هالان تەواوی
لەشیان داگرتم- خێرا خۆم
دەباوەشی کوتا وئیتر خۆم
پێ رانەگیرا ولەقڵپەی
گریانمدا .

دەستی لەسەری وەردەدام و
بەباوەشی یەوە دیکوشیم
دەیگوت :

چی بووە رۆڵە بڵێ؟
رق وقینم - سینگ وگەرومی
داگرتبوو نەم دەتوانی چی
پێ بڵێم هەرگریان بوو،لەپڕ
باجیم پەیدا بوو.

- بەخێربێ یەوە کابرا - تۆ
دەزانی‌کاکەعەلی فێربووە
بەشەقەوە بۆمان بێ پڕی‌بە
گوارەکەم‌داکرد هیندەی‌نەمابوو
گوێم هەڵ دڕێ، ئیتر خێرا
باوەشی باوکم شل بۆوە،وەک
مردووی لی‌هات،گەرمایی باوە
- شی تەواوبوو وەکووهەوری
تاڵی لێ هات،بەپەلە دای‌نام
بەسەری داگوڕاندم.

ئیتر نەبیسم بەباجیت
جوێن بدەی، دەزانی هەمیشە
لەفیکرت دایە، لباست بۆ
دەشوا چێشتت بۆلێ دەنێ،
ئەمەبەپاداشی چاکەی کە
دەیدەیەوە.

خەریک‌بووم چاوم لێک نێم
وگوێم بگرم وبەتوندی‌بنەرێنم
وبڵێم.

- بۆهەرمن لەم ماڵەدانان
دەخۆم! بۆخۆتان هەمیشە
بەرۆژوون؟ بۆتاقە دووکوت
لباس بچولەی من هێندەی‌ئەرکە
کەوام بەسەربێ؟ بەڵام‌زبانم
گەڕابادوو هێندەی دیم‌ئیجارە
بوو (دووهێندەی دیم‌وێدەکەوت)

بەدوای ئەو بەزمەدا سەرم
داخست‌وچومە ژوورەوە لەجێ
جارانی دایکم دانیشتم
هێندیک سوکنایی بەجێ‌نەقوچک
ومستەکانی ڕان وپشتم‌داهات
وخەریکی وردە هەنیسکی دوای
گریانم بووم. کەباوکم
هەرای لێکردم "عەلی"وەرە،
نانەکەت‌بخوا ئیتر ئەمیش
کەتازە- خۆشەویستی خۆم‌لەم
ماڵەدابەپچڕاوی دەدیت.
بێ دەنگێکی لەلای خوارەوەی
سفرەکە بەئەدەب‌دانیشتم‌و
خەریکی نان خواردن بووم کە
چاوم هەڵ بڕی سەعات نزیک
چوونی مەدرەسەیە بەپەلە
هەستام کەوشم دەپێ کەم
وهەڵێم - باجیم- هەرای
لێکردم.

- ئەدی چایەکەت بەزەهر
ناکەی؟بەلالوتێکەوە گوتم:
"نا" ورۆیشتم- گوێم‌لێ بوو
کەباوکم بەباجیمی گوت:

دەبوو لەسەرئەو"نا"یەلێم
دابا بەڵام تازەقەیدی ناکا.

. ئەمەبوو بەسەرهاتی تەنها
رۆژێکم، وبەهۆی هەزاران ر-
ووداوی تاڵی ژیانم رازی‌بەوە
نیم، ئەوچاوە جوانانەی"وریا"
تەم‌وغەوری خەمی زڕدایکی
لێ نیشێ!!!

# شاعیرانی لاو

## شینی سەردەشت جینایەتی حیزبی بەعس

هیرۆشیما دێنێتە یاد،
جەستەی زاماری شارەکەم
دەستی پیسی شەڕە کەوا
دەسووتێنێ گوڵزارەکەم

* * *

بەتاوانی بێ تاوانی
دەسووتێنێ هێلانەکەم
بەشیمیایی دەیرشێنێ
شارو کووچەو کۆڵانەکەم

* * *

ژاری مەرگە لەوڵاتم
بەچووک وگەورەی دەچێژێ
خوێنێ گەشی لاوی کورد ە
شەری داسەپاو دەیرێژێ

* * *

هەرگوڵی ژینن ئەپرووکن
بەئاوری بێ ئامانی شەڕ
مەگیرانی بەخوێن دەکا
ئەفلەقی پڕ زیان وزەڕ

* * *

کوورەی نەمانی کوردە وا،
بەرزە بڵێسە وگڕی
خۆشی دەکا نەکا جارێ
بەسەریا بێ ساردوسڕی

* * *

هەرواگوڵەوپەرپەردەبێ
لەپووشپەڕی وەرزی تەمەن
ئاسۆ نوقمی خوێنە! سوورە
لەبستۆکەی بەرزی وەتەن

* * *

ب. بریاجی

## پیری

پشتی ورەی پۆلاینم
مەترسی مردن دایمووکاند
پلاری سستی وبیماری
باڵی شیعرەکانمی شکاند

* * *

نووکە گاسنی گای زەمانە
دای لەهەردی هەرزەکاریم
کیلای کێلگەی خەیالاتم
شکاندی گەنجی دلدا ریم

* * *

قرچەی گەرمای هاوینی ژین
خەونەکانی تواندمەوە
پیری لەسەرکێکی تەمەن
گەلێ شەمی کوژاندمەوە

* * *

پیرەداری هێزوباهۆم
گەندەڵەداری ڕزیوە
کێوی سەوزی لاوەتی من
بەفروسەرمای تێ خزیوە

* * *

نەماوە باوی لاوەتیم
تەنیام لەگۆشەی بێدەنگی
تەپۆلکەم لێ بووەبەهەڵگورد
لەبەر هەوری نەفەس تەنگی

* * *

بەچاویلکە لێی دەگەڕێم
لە دەورانی تازە ساڵیم
بەپشتی کۆم هاواردەکەم
کوا جەوانیم، کوا منداڵیم

ک. د. ئازاد

## ئاوات

دەمەویست
گولێ بام لەناوباغی ژینتا
سوور
دەمەویست
کێوێک بام
لەکوێستانی بەرزی ژینتا
بلێند
دەمەویست
لوتکەیەک بام
لەدەریای فرمێسکی ژینتا
بچووک
بەڵام گولی سوورم
بووم ونەبووم
پەڵەخوێنێک بووم
کەلەچاوەجوانەکەترا
تکامە سەر رووی عەرز
بەشێواوی دلی بەغەم
بەری رووناکی ئەندیشەو
ژینی بەخۆشیم گرتبوو !

سولەیمان زارعی

## دەریا

لەرووبارێکم دەپرسی
ئەگەر رێگات بێ وەگەڕێی
بۆباوەشی دۆڵ وچیا
دەچیەوەیا
دیسانەوە دەگری رێگا
وتی :
دایکی هەموو رووبارێک دەریایە
دەچین لەوێ یەک بگرین
چەپلەی یەکدەست دەنگی نایە

ک . د . ئازاد

## سبەینێ

خەفەت مەخۆ
دامەنیشە دەستەوئەژنۆ
مەلێ چ بکەین
ئەو ژیانەی دەمانەوێ
دەبێ گۆرانی بۆ بلێین
خۆمان دەبێ سازی بکەین
دلنیابە ئەورۆژەدێ
لەژێرسایەی ئالای ئیسلام
کەس زگی برسی خۆی نەکوشێ
کەس لەرێ وبانان نەخەوێ
پادگان وقۆرخانەکان
دەبن بەباخچەی مندالان
لەئاسمان بەجێی دووکەل
دەبینی شەقەی شاباڵان
دارودرەخت چرۆدەکا
لوولەی رەشی چەک وتفەنگ
دەبێتە هێلانەی کۆتر
بۆسۆی گولی گەنم نایە
چەوسانەوەش
دەچێتە گۆڕی تەنگەبەر
خەفەت مەخۆ
خەفەت مەخۆ
خەفەت دەستەوئەژنۆ
دامەنیشە
مەلێ چ بکەم ؟
مەلێ چ بکەین ؟

شێواو

بەپرەی شین وگریانی
چەپکێ وشەی شیعری تاساو
لەخەوهەستام
وتم کۆرپەم
جگەرگۆشەم
بۆچی دەگری؟
چەند هەنیسکێکی داو وتی:
هەتا کەنگێ
لەزیندانی دەفتەری شڕدا
رامدەگری ؟

رەوەند

# دیقل و ریوی

**پەرویز جهانی**

رۆژەک ل رۆژێد بوهاری
کەلەشێر بهێڤیداری
ل گوند دەرکەت وچوو چۆلێ
خو گیهاندە ناڤا دۆلێ
گولاوین بوو هەوا بوهار
بشکفتی بوون هەرگول ودار

ناڤ چیمەن ودارو بەرا
تەماشە کر ل هەردەرا
کەیفا وی هات پەڕێ رەنگین
ل هەڤ داو کرە قووتین
دەنگێ وی یێ بەرزو ئازا
کەتە چیاو زانگ و رازا

تـوچـرا چـووى فـيـێـزا دا رێ
ژمـن بـۆدكـى فـرا رێ ؟
بـۆدتـرسـى بـرا ، تـوژمـن
ئـەزى دۆسـتـم ، نـەكودوژمـن
وەره ئـەم دۆسـت وهـەڤـالـن
ئـەم دۆسـت ، نـا سـێ بـاڤ وكـالـن
خـۆشـا مـن هـات ل وى دەنـگـى
هـاتـم بـاتـە ب خـۆشـرەنـگـى
بـەەبـەە بـنـێـرە هـەوايـێ
ل بـێـهـنـا خـا ش وسـەفـايـێ
بـنـێـر مـيـێـرگ وگـول وچـيـچـەك
سـۆسـن ، بـەيـبـوونـێ چـاڤ بـەلـەك

دەنگـێ وى گـوهـێ رووڤـى كـەت
رووڤـى بـۆرا ڤـێ پـەى وى كـەت
لـەمـەلـەم* هـات رووڤـيـێ فـێـلـبـاز
بـەر بـديـک چـوو ب تـەول وبـاز
دەمـا كـو ديـک دوژمـن بـديـت
دلـكـا وى تـرسـا هـلاقـيـت
هـەلات وپـێ دا فـرا رێ
بـا زدا ، فـڕى چـووسـەردا رێ
رووڤـى ديـت ديـک ژدەسـت دەركـەت
نـەمـا ژێ ڕاكـەلـێـن،دەرفـەت
چـوو بـەردا رێ بـپـۆلـۆتـقـە*
كـێـشـا نـەخـشـە وحـيـلـەوحـۆقـە
گـۆتـێ سـەلام بـرايـێ بـاش
بـرايـێ بـاسـک جوان ،دەنگ خـاش

وەرە ئەم بکەن سەیرانێ
ل ناڤ مێرگێد ڤێ زۆزانێ
بانگ بدە بدەنگێ بلند
دەنگ ڤەدە ل بازارو گوند
دیک گۆتێ هەڕە خاپ* خاپین
بۆمن تونەخشەیا نەکشین
دزانم تو هەر دوژمنی
تو نەیارو دژی منی
رووڤی گۆت چەندێ سۆسرە*تە
جێ زەندە*مان وعێبرەتە
برا تو بۆم ناناسی
بۆهند بێ هەست وهەواسی ؟
ئەزو باڤێ تە ئەم دۆستن
دوجان لناڤا یەک پۆستن
دهوونی من دیت باڤێ تە
م لێ هلدا سلاڤێ تە
دیک کەنیا وکر قڕەقڕ
گۆتێ بەسە دەرە وڤڕ
باڤێ من پارڤا مری یە
ئەمرێ خودێ جی ئانی یە
رووڤی گۆتێ ئەرێ ئەرێ
م خوشاشکر ل وێ دەرێ
رەحمەتییێ باڤێ تەنەبوو
ئەواکم گۆت دایکا تەبوو
ڤێ پرسێ لێم ببۆرینە
برایێ دیک، ببەخشینە
ئەزگشتی بنەمالاوە
ناسدکم تێمە مالاوە
نزام چڕا توم ناسناکی
پرسا خۆ ژمڕا راسناکی

دیک گۆتێ ئەز تەناسدکم
دوول وبابێ تەراسدکم
دزانم تویی نەیاری
دوژمنی تو قەت نەیاری
رووڤی کەنییا بفێلبازی
حەتا کو دیک بکە رازی
گۆتێ توچەند بێ خەبەڕی
دبێژی پرسا سەرسەری

ماتە نەبهیستی فەرمان
فەرمانا شێرسەرەک حەیوان ؟
شێر فەرماندایە هەردەرا
شاندییە گشت دەشت و دەرا
گۆتی دوژمنایێ نەکن
دەرکێد خۆشیێ لەخۆڤەکن

ئێدی تونه شه‌ڕو کوشتن
زۆرزۆر یاساغه خوونڕێژتن
سه‌گ وڕووڤی بوونه هه‌ڤال
دۆستن که‌له‌شێر وچه‌قال
می وگورێ ته‌ڤ بچێره
به‌ره‌ڤ دکن شوور وکێره
خرڤه‌دکن تۆپ وتوفه‌نگ
ئێدی چنینه شه‌ڕوجه‌نگ
دیکێ پشتا ڕووڤی سیاربه
گورێ بۆ په‌ز نۆبه‌داربه
خوئه‌زما مه زه‌نده گرتی
ته‌فه‌رمان بۆنه‌بهیستی ؟
ل وێ ناڤێدا که‌له‌شێر
بئێمناتی وبه‌ربهێر*
گه‌رده‌ن درێژو نێزه کر
به‌ر بگوند ئه‌وی مێزه‌کر
ڕووڤی گۆتێ بخۆش، خێری
تو زل مایی چ دنێڕی؟
دیک گۆت حه‌یوانه‌ک وایه‌دێ
بله‌زوگه‌ف وگور وچێ
ئوسا دێ وه‌ک بایێ به‌زێ
نزام چڕا دکه له‌زێ
ئه‌و هه‌روه‌کی ته کولکینه
گوه‌پان وزۆر دیل هه‌ژینه
ژته‌مه‌زنتره وپرچین
ژگوند ده‌ردێ، بکه‌ل وبین
ئه‌ز خوه‌ژی ناس ناکم چییه؟
نزام هرچه،یان ڕووڤییه
ده‌ماک ڕووڤی بهیست هه‌وار
ئه‌وخه‌به‌را توند ودوژوار

ژدیک دوورکه‌ت وکه‌ته‌رێ
دگه‌ریا ل رییا ڕه‌ڤێ
دیک گۆتێ تێ کودا هه‌ڕی
ئاخر توچڕه دڕه‌ڤی
ڕووڤی گۆت نیشانێک ته‌دان
گه‌ماله یان سه‌یێ شڤان
ئه‌م وئه‌وانا نه‌یارن
نه‌یار ،دوژمنێ خووندارن
دیک گۆتێ ئه‌هه‌ی ده‌ره‌وین
ئه‌هه‌ی فێلبازێ خاپخاپین
ته‌نه‌گۆت نه‌یاری تونه
یاساغ بوویه‌خوونڕێژتنه؟
بوونه دۆست گشتی دوژمنه
لی ئه‌و چی ڕه‌ڤ ، هه‌لاتنه؟
ڕووڤی گۆت پرسێ ته‌راسته
دۆ ژی هه‌ر برایێ ماسته
ئه‌ز دترسم سه‌یێ شڤان
نه‌بهیست به‌وه‌ک ته‌فه‌رمان
ئه‌وێ وه‌ره م زه‌حی که
پرسا دوستانیێ نه‌هی که
ئه‌ڤه‌گۆت وکه‌ته چۆلێ
ڕه‌ڤی خوه داپشتا دۆلێ

## دیاری

## مەتەڵ

یەک پێ لە دەشتێ
دوو پێی گەیشتێ
ستی یە سەرتەنیشتێ
" درووێنە "

گوێلەوسارم ئاو دەدا
گوێلکەشین هەڵدەمسا
" ئاوداشتنی شووتی "

خانمە خانم دابەزی
کەوتە بیری چل گەزی
سەری پڕبوو لە دەرزی
" کەنگر "

سپی یە پەنیر نیە
کلکی هەیە مشک نیە
" توور "

ئەوە چیە، ئەوە چیە
دوو دیو کوڵەکێکی هەیە
" کەپۆ "

تەپە خڕیلە
گیا وردیلە
" سەر "

هەوەڵ چوار لاقە
دوایە دوو لاقە
ئاخری سێ لاقە
" ئینسان "

## پەندی پێشینان

ـ راستۆل رێ دا، خارۆ دقەهرا خودێ دا.
ـ کەس ل رێ یا راست دا بەزرنابە
ـ دونیا ببەکەس، مرۆڤ نابێژە بەس
ـ گاب جلا نایێ ناسکرن
ـ هەسپێ نێر ب دەست ولەپێ خۆدەردکەڤە.
ـ *بۆز ب هونورێ خۆدژی
ـ تونەبوون ریشاکۆتی بوونی یە.
ـ چاڤێ دەریا، خولی ل سەری یا.
ـ چاڤ ب چاڤا دکەڤە چیا ب چیا ناکەڤە
ـ پۆستێ هێشترێ بارێ هێسترێ یە.
ـ بلا کچ بەبلا پیربە، بلارێ بەبلا دویربە بلا بهۆری بەبلا کوێربە.
ـ دیزک دبێژە بەرۆشێ رووتەنی.
ـ هەسپا چێ رکێفا ل خۆ نادە.
رەشی بەرتاوێ سپی نابێتەوە بە ئاوێ.
دەستێک بەتەنێ تەقەی نایە.
قسە کەوتە زارێکی دەکەوێتە شارێکی.

بۆ مردووی پار هاوینێ
مەگێرە تازە گەرمەشینێ
ئەوەی لەمشک بێ هەمبانە دەبڕێ.
بەپەلە ژن مەهێنە تا بە شێنەیی پەشیمان نەبیەوە.
لە هەموو هەوران باران نابارێ.
دەریا بەجێ دمی سەگ پیس نابێ.
نە باغەوان کوڕی لەبیر دەچێ نە مار کلک.
قەت خوێن نابێ بە ئاو.
کارکەری شیرین
نوێژکەری نوورین
کەس بەخەیاڵ نابێتە ماڵ.
دز بازاری شێواوی پێخۆشە.
نە یاری زانا، نە دۆستی نەزان.
گاوان بەگاوانی خۆی پێ عەیب نیە
نان خرکردنەوەی پێ عەیبە،
هەر تەیرێک لە رەوەی خۆی دابڕێ باڵی دەشکێ.
هاوینان سەرت بکوڵێ
زستانان دیزەت دەکوڵێ
هاوینان بکەی قەپۆزە
زستانان دەکەی دەرۆزە
چ بچێنی ئەوەی دەدرووییەوە.
ئەو چاوە کوێر بێ دوژمنی خۆی ناناسێ.

کوڕێک ژنێکی تەمبەڵی دەبێ. ڕۆژێک لەگەڵ بابی تەگبیر دەکەن کارێکی بکەن بەڵکوو ئەو ژنە حەیا بیگرێ وکار بکا.
باب گەسکێک بەدەستەوە دەگرێ ولەحەوشە رادەوەستێ بە کوڕەکەی دەڵێ:
– راوەستە من حەوشە گەسک بدەم
– نا بابە. بەسەری تۆ نابێ! خۆم گەسکی دەدەم
ژنە وەجواب دێ:
– شەڕی ناوێ. هەرڕۆژە یەکتان بیماڵن!

– ئینگلیزی دەزانی؟
– بەڵێ دەزانم بپرسە.
– بەجیرەی دەرکە دەڵێن چی؟
– ماڵتە وەدەزانی ماڵی تۆیە. کوا ئینگلیزی دەرکەیان جیرەی لێ دێ؟

پیاوێک بەسواری کەر بەنێوەراستی خیاباندا دەڕوا پۆلیس دەیگرێ ودەڵێ:
– جەریمە بدە! نازانی ئەوکارە خیلاقە؟ سەت و پەنجا تمەن بدە!
– بۆ سەت وپەنجا؟
– سەتی خۆت وپەنجای کەرەکەت؟
– قوربان هەرنەبێ وەک کەرەکەم حیسێب بکە و پەنجاش لەمن بستێنە؟

●●●

– ڕۆڵە ئەوە. بۆ وا داماوی؟
– وەڵڵاهی دایەگیان نازانم! چەندرۆژە چاوەڕێم رۆژنامە بێ وبزانم لە کۆنکوور قەبووڵ بووم یا نا، ئەوڕۆ کڕیم بەڵام ناوی منی تێدا نەبوو.
– هەی لەمنت نەکەوێ، ها ئەوە دوو تمەن بڕۆ رۆژنامەیەکی دیکە بکڕە.

ئەم وشانە کە لەم ژمارەی گۆواردا نیشانەی( ※ )یان بۆدانراوە لێرەدا مانا کراونەوە.

# فەرهەنگۆک

**کێلێز** : کێل و بەرد

**قولانج** : مەودای نێوان قامکی شادە وقامکی گەورە بەراکشاوی .

**مێرمندال** : لاوێکی تازە تەمەنی لاوەتی دەست پێکردبێ.

**شاتللۆرە** : خللۆر بوونەوە وەک گاشە و جالە.

**ترازان** : لە جێگە و رێزی خۆ دەرچوون .

**دارچەلە** : ئەو دارە ئەستوورە کە چیغی پێوە دەبەستن ، چەلەکە.

**شوول** : لقە بی یەکسالە کە باریک ودرێژە وسەلە وسەوەتەی پێ دروست دەکەن یا بۆ چیغ کەلکی لێ وەردەگرن .

**بەرجی** : بێجگە، جگە لە، سەرەرای .

**گەلەکۆمە** : هەرەوەز، یارمەتی گشتی لە کاردا.

**کۆل کۆل** : چین چین .

**پۆل پۆل** : دەستە دەستە .

**نێر** : بەرجی مانای ئاسایی ، بەو دارو گیایەش دەلێن کە گول و تۆو ناکەن و زۆر بەرز دەبنەوە.

**دۆپ** : پاوان ومێرگ ، لەوەرگە.

**کۆبە** : قەراغ .حاشیە

**سەرتیک** : جەمسەری دروومان .

**تێک قرمان** : تێک رووخان .

**چربی** : لک وپۆپی دارە بی .

**تەرشداری**: مەرداری .

**هێژا** : شایان ، شایستە

**چاوا** : چلۆن .

**زۆزان**: کوێستان .

**ئاران**: گەرمێن .

**مهی،می** : مەڕ

**کەری** : رەوە ، مێگەل .

**بانین**: وەخۆکردنەوەی بێچوو.

**قسە بزرکاندن** : ورێنە

**مێژۆکە** : بەرخی تازە لەدایک بوو.

**زایەلە** : دەنگدانەوە، تەنین .

**نارە** : گۆرانی بن لێو.

**زراندنی خەو**: بێ خەوکردن ، خەو پەراندن .

**هەیڤ** : مانگ .

**داتووکان** : داسەکنین (بتمرگ)

**پاناوک** : زەوی پان وسافلەقەدی کێو.

**راز** : رەوەز .

**بەربەست** : سەد.

**شیواو**: ئەو شوێنە چۆمی پێدادەڕوا.

**پیاسە**: قەدەم لێدان .

**رەهەند**: کانال .

**خر** : دۆل .

**توێلک** : توێکل وپێستی دارومیوە

**بۆهەرنەهووت** :بۆ ترشاوو گەنداو.

**تەنەوە**: بلاو بوونەوە، داگرتن .

**کەلەپوور**: میرات ؟

**خێرۆک**: گەنم یا حاسلێکی لە تۆوی رژاوی سالی رابردوو شین دەبێتەوە وخاوەندەکەی زەحمەتی لەگەل نەکێشاوە .

**نامۆ**: بێگانە ، بیانی .

**تەگەرە**: گرێ ، کۆسپ .

**رمێن** : رەواج .

**قەرقەش**: گێرە و کێشە .

**مەنشوور**: مەشهوور ، بەناوبانگ

**چاوبەمۆلەق وەستان** : رەنگی مردن بەخۆوە گرتن .

**گلان** : کەوتن وهەلنەستانەوە .

**گوولک** : چرێش ، پانجارەکی کێوی یە

**سێ بسکە**: پانجارەکی کێوی یە ولە ئاش دەکرێ.گیا دۆکلیو

**بەلەکی** : کەوی بەفر.

**شەمزە** : بەرخ وکاریلەیەکی کەلە چیا لەدایک دەبێ.

**خەلەندۆر**: هەوەلشیری مەرومالات کەپاش کولاندن لەفرۆ توندترە

**چرپاندن**: قرتاندن، گول چنین .

**پێسیر**: ئەتەک ، ئاتەگ .

**ساز** : قامیش ، زەل .

**هۆگج** : بەرانی سێ سالە .

**ماز** : بەرانی چوارسالە

**درماز**: بەرانی پێنج سالە

**پەرژین** : پەردە .

**بینبەر**: دیمەن .

**هەیلۆ**:تا ، هەتا .

**مەرف**: مرۆڤ ، مەری .

**باق** : باقە .

**قزلاندن** : هەلقرچاندن وسووتاندن.

**پنجار** : پانجار، سەوزی کێوی.

**وەرێنە**: بێنە .

**حەشەری**: گەرم داهاتوو .

**بەرۆدان** : زاووماک .

**مشە** : زۆر، گەلێک .

**ئارش** : مەعنی . مانا . واتا

**شلێر** : جۆرە دەغلێکە کە لە گەنم باریکترە نانی لێ ساز دەکرێ . نانەکەی رەشە. چێودان

**پەلەخ** : گیا رەشەی درشت .

**چیل** : زۆر سپی .

**گەمال** : سەگ ، چواربێ

**لەمەلەم**: تەلەتەل ، ماتە ماتە.

**پۆلۆتقە**: کلکە سووتە .

**سوسرەت** : عەجیب .

**بەربهێر** : لەسەرەخۆ.

**زەندەمان** : سەرسورمان .

**قەف** : ئالقە، گرێ.

**جەلە** : رستە،گوریسی ئالقەکراو.

**سوور** : کۆی گەنمی خاوێن و ئامادە.

**بەقوون داختن** : وەپاش دان. وەدواخستن .

**سی** : سیپەلک . ریە .

**قۆستنەوە** : گرتنی بەپەلە. گرتنەوەی ، بەپەلە. رفاندن .

**لە حەجمەتان** : لە حەیفان. لە داخا، لە تووڕەیی

**لاترەی بەست** : کەوت .هەلەنگووتن وکەوتن .

